# نامەی

# ڕێنوێنی کەسنەزانی

# لە تەریقەتی پیرۆزی عەلیی قادری کەسنەزانی


نوسین :

د. شێخ نەهرۆ کەسنەزانی قادری حوسەینی

سەرۆکی تەریقەتی قادری کەسنەزانی لە جیهاندا



وەرگێڕان :

هەژیر ئیسماعیل لالە ئەحمەد

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

اللهُمّ صَلِّ على سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ الوَصفِ وَالوَحْيِ وَالرِّسَالَةِ وَالحِكْمَةِ وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَسَلِّمْ تَسليماً

**"ڕێنوێن قورئانیکی وتەبێژە و ڕێنمایی کردن بنەمای خودا پەرستیە"**

**{فەرمایشتی سەید شێخ سوڵتان خەلیفە موحەمەدی موحەمەدیی کەسنەزانی حوسەینی (هیمەتی حارز بێت)}**

**"ڕێنوێن پێویستە وێنەیەکی بچووککراوەی شێخ بێت و وێنەدانەوەی حەزرەتی پێغەمبەر (سەڵەواتی خودا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) بێت لە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە"**

**{فەرمایشتی سەید شێخ نەهرو کەسنەزانی قادری حوسەینی (هیمەتی حارز بێت)}**

# پێشەکی

ئەگەر مەبەست لە دروستکردنی جنۆکە و مرۆڤ لەلایەن بەدیهێنەری مەزنەوە بریتی بێت لە پەرستنی وەک دەفەرموێت : ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنْسَ إِلا لِيَعْبُدُونِ﴾ (واتا : جنۆکە و مرۆڤم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بمپەرستن) ، و بەپێی ئەوەی کە ڕێنمایی کردنی بەندەکان بریتیە لە بانگەواز بۆ پەرستنی خودا و ڕێکخستنی ڕێگای نێوان بەندە و خودای گەورە و گرتنەبەری ڕێگەی ڕاست و ڕەوان کە بەندە دەگەیەنێت بە خودای گەورە بەمەش ڕێنمایی کرد مەبەستی هەرە سەرەکییە لە هەبوونمان لە دونیادا ، پێویستە لەسەرمان هەموومان وەک ڕێنوێن و جێنشین (خەلیفە) و موریدەکان هەستین بە ئەنجامدانی ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە فەرزە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی نێر و مێ ئەمەش چونکە بانگەواز بۆ خودای گەورە ئەرکێک بووە لە ئەستۆی کەسانێک کە لە ئێمە باشتر بوونە کە ئەوانیش پێغەمبەران و پیاوچاکانن ، و ئەوە ئەرکی باشترینی بونەوەرەکان و چرای تاریکییەکان پێشەوامان حەزرەتی موستەفا (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) بووە ، خودای گەورە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێت : (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ) (واتا بانگەواز بکە بۆ ڕێگای خودا بە دانایی و وتەی چاک و بەو شێوەیە لەگەڵیان بدوێ کە باشترە) ، و بانگکردنی خودا بۆ حەزرەتی موستەفای خۆشەویستی خۆی بریتی بووە لە ڕێنمایی و ڕێنوێنی کردنی بوونەوەران بەوەی کە لەلایەن خوداوە بەسەریدا دابەزیوە و خودا بووە بە پشتیوانی لەوەی کە پارێزراوبێت لە خەڵک و ئینکاری و ڕێگەلێگرتن و ئازاریان .

فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە و بانگەواز بۆ خودا و ڕێنمایی کرد بۆ ڕێگای خێر و چاکە بریتیە لە هۆکاری هەموو سەرکەوتن و ڕزگاربوونێک : ﴿ وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ (واتا ئەگەر کۆمەڵێک لە ئێوە هەبن کە بانگەواز بۆ چاکەکاری بکەن و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە بکەن ئەوا ئەوانە دەبنە سەرفرازەکان) ، خودای گەورە مژدەی داوە بە بانگەوازکار و ڕێنوێنەکان بە سەرکەوتن و سەرفرازی ، چ سەرفرازیەکیش ! ئەو سەرفرازیەی کە خودا مژدەی پێداوە لە دونیاکەی تردا دوای ئەم دونیایە.

کۆمەڵگای سەرکەوتوو و سەرفراز و سەلامەت ئەوەیە کە تاکەکانی ڕێگری لە خراپە بکەن و فەرمان بە چاکە بکەن لە نێوان خۆیاندا ، بەڵکو هەندێک لەوانە هەیە کە لەم ئەرکە پیرۆزەدا پسپۆڕی پەیدا دەکات ، ئەو کەسەی کە هەموو خەم

و کار و ئامانجەکەی بریتیە لە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە کە تێیدا دڵخۆشـی و سـەربەرزی بەدەست دەهێنێت وەک جوتیـارێـک کە دڵخۆش دەبێت کـاتێـک دەبینێت کێڵگەکەی بەرهەمـدارە و بەمەش ئەو بەرهەمەی بە ماندووبوونی خۆی و شەونخونی و هەوڵدان دەستی کەوتووە بەدەستی دەهێنێت .

داواکراو نییە لێت ئەی ڕێنوێن (مورشـید) کە باشـتر بیت لە خەڵک بۆ ئەوەی ڕێنوێنیان بکەیت ، چونکە کامڵبوون تەنها بۆ ئەو بەندانەی خۆیەتی کە کامڵ بوونە ، بەڵام تۆ دەتوانیت حەزت بەکاری چاکە بێت و دژ بە کاری خراپە بوەسـتیتەوە وەک فیترەتێک کە خودای گەورە مرۆڤەکانی لەسەر دروست کردووە ، ئەوەندەی لە تواناتدا هەیە ڕەهنومایی خەڵک بکە ، شافعی (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەفەرموێت :

"ڕقم لەو کەســـەیە کە بـازرگـانی بە گونـاهەوە دەکـات ئەگەر تەنـانەت هەردووکمـان لە کـاڵاکەدا پێکەوە بووین" ، لە ئەنەسـەوە (ڕەزای خودای لەسـەربێت) دەگێرنەوە فەرموویەتی : وتمان ئەی پێغەمبەری خودا : فەرمان بە چاکە نەکەین هەتـاکوو خۆمـان هەمووی ئەنجـام نەدەین ، و ڕێگری نەکەین لە خراپە هەتـاکوو خۆمـان لە هەمووی نەپـارێزین ؟ ، حەزرەت (سەڵەواتی خودا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) فەرمووی : (بەڵکو فەرمان بە چاکە بکەن ئەگەر تەنانەت کارتان بە هەمووی نەکرد ، و ڕێگری لە خراپە بکەن ئەگەر تەنانەت خۆتان نەپاراست لە هەمووی) ، ئەو کەسـەی کە ناکەوێتە ناو گونـاهـــ و خراپەکاری بریتیە لە کەسی کامڵ ، خۆ ئەگەر فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە تەنها ئەرکی کامڵەکان بوایە ئەوا تەنها بۆ پێغەمبەران و پیاوچاکان و شێخە کامڵەکان دەبوو.

گەورەیی ئەرکەکە :

خودای گەورە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێت : ﴿ومَن أحْسَـــنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعا إلى اللَّهِ وعَمِلَ صـــالِحًا وقالَ إنَّنِي مِنَ المُسْـــلِمِينَ﴾ (واتا کێ قســـەی لەو کەســـە باشـــتر کە بانگەواز بۆ خودا دەکات و کاری چاکە دەکات و دەڵێت من لە موسوڵمانەکانم) ، لەم ئایەتەدا خودای گەورە ستایشی ئەو کەسانە دەکات و دەفەرموێت کە قسەی هیچ کەس لەوان باشتر نییە.

ئـایـا ســـەربەرزی نییە بۆت کە لەو کەســـانە بیت کە بـانگەواز بۆ خودا دەکەن و کـاری چاکە دەکەن و دەڵێن من لە موســوڵمانانم ، چ دڵخۆشـیەک دات دەگرێت کاتێک دەیڵێیت و چ ســەربەرزیەک هەسـت پێ دەکەیت کاتێک بانگەواز بۆ

ڕێگای خودا دەکەیت ، خودای گەورە دەفەرموێت : ( لَيْسُوا سَوَاءً ۗ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْـــجُدُون - يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُسَـــارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُولَٰئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ) (واتا ئەوانە کەسانێکی ئاسمانین کە کۆمەڵێکی سەرفرازن ئایەتەکانی خودا دەخوێنن شەوان و کڕنووش دەبەن – باوەڕ بە خودا و ڕۆژی دوایی دەکەن و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە دەکەن و خێرا دەکەن بۆ چاکەکاری و ئەوانە لە پیاوچاکانن) ، خودا شـــاهیدی بۆیان نەداوە بەوەی تەنها چاکن لەبەر ئەوەی باوەڕیان بە خودا و ڕۆژی دوایی هەبێت بەڵکو فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپەی خســـتە پـاڵیەوە ، خودا دەفەرموێت : ( وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُـــهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّـــلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُـــولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ سَـــيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) (واتا ئەو ئیماندارانەی کە فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکەن و نوێژ ئەنجام دەدەن و زەکات دەدەن و گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەرەکەی دەبن ، ئەوانە خودا ڕەحمیان پێ دەکات ، خودا دانا و شـــکۆمەندە) ، خودا لێرەدا بڕوادارانی بەوە ســـتایش کردووە کە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە دەکەن ، ئەو کەسەی کە فەرمان بە چاکە نەکات و ڕێگری لە خراپە نەکات ئەوا دوورە لەو بڕوادارانەی کە لە ئایەتەکەدا ئاماژەیان پێ کراوە.

خودای گەورە دەفەرموێت : (الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُوا الصَّـلاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ) (واتا ئەو کەسـانەی کە لە زەویدا دامانناون کە نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکەن) ، لێرەدا خودای گەورە نوێژکردن و زەکاتدانی لە ستایشی چاکان و ئیمانداران بەکارهێناوە .

حەزرەت (ســەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (کارە چاکەکان لە چاو تێکۆشـــان لە پێناو خودادا وەک دڵۆپێکە لە دەریایەک ، بەهەمان شـــێوە هەموو کارە چاکەکان و هەموو تێکۆشـــانەکان لە چاو فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری لە خراپە وەک دڵۆپێکن لە دەریایەک).

ئایا بەس نییە بۆت کە حەزرەت (ســەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) مژدەی پێداوی و فەرموویەتی : (هەرکەسـێک بانگەواز بۆ ڕێی هیدایەت بکات ئەوا پاداشــتی بە ئەندازەی پاداشــتی ئەو کەســانە دەبێت کە شــوێنی دەکەون و هیچ لە پاداشــتی ئەوان کەم ناکاتەوە) ، و بە دروســتی هاتووە لە حەزرەتەوە (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) کە بە حەزرەتی عەلی (ســەلامی خودای لەســەربێت) فەرمووە : (ئەگەر خودا تەنها کەسـێک لەسـەر دەسـتت هیدایەت بدات و

بیخاتە سەر ڕێگای ڕاست ئەوا ئەمە لە هەر شتێک باشترە کە خۆر لێی بدات) ، مژدەت لێبێت کە گوێت لە فەرمایشتی حەزرەت (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەبێت کە دەفەرموێت : ( فریشتەکان و دانیشتوانی ئاسمانەکان و سەر زەوی و تەنانەت مێروولەیەک لە کونی ماڵەکەی و نەهەنگەکان لەناو دەریادا نزا بۆ ئەو مامۆستایە دەکەن کە خەڵک فێری چاکە دەکات) ، و هاتووە لە حەزرەت (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) کە فەرموویەتی : (قسەکانی هەموو مرۆڤەکان بەڵگەیە بەسەریانەوە نەک بۆیان تەنها فەرمانێک بە چاکە یاخود ڕێگریەک لە خراپە یاخود زیکرێکی خودای گەورە نەبێت) .

ڕێنوێنیکار پیرۆزە بچێتە هەر شوێنێک و لەهەر شوێنێک دەرچێت :

بۆ بانگەواز بۆ خودای گەورە خێر و خۆشی دەڕژێت بەسەر ئەو کەسەی ئەنجامی بدات ، تەنها ئەو کەسەش هەست بەم بەرەکەتە دەکات کە لە ڕێگای بانگەوازدا بڕوات ، مامۆستایەک بێت بۆ فێرکردنی چاکەکاری و بانگەواز بۆ خودا بکات و بەبیری خەڵکی بهێنێتەوە ، هانی خەڵک بدات کە گوێڕایەڵی خودا بکەن ، ئەوەشــــی ئەمەی نەبێت ئەوا بێبەشـــە لە بەرەکەت ، بەوەی کە خەڵک ڕێنوێنی بکات و فێریان بکات و ڕەهنومابیان بکات ئەوا دەرگای هیدایەت بەڕووی دەکرێتەوە ، چونکە پاداشت دانەوە بەشێکە لە کارکردن ، هەتاکو زیاتر خەڵک ڕێنوێنی بکات و فێریان بکات ئەوا خودا زیاتر هیدایەتی دەدات و زانستی فێردەکات ، بەم شێوەیەک دەبێتە کەسێکی هیدایەتدراو و هیدایەتدەر ، وەک لە نزای حەزرەتی پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : "خودایە بمانڕازێنەرەوە بە ئیمان ، بمانکە بە هیدایەتدەر و هیدایەتدراو ، نە گومڕا بین و نە گومڕاکەر ، ئاشتیەک بین بۆ دۆستانت و جەنگێک بین بۆ دوژمنەکانت ، بە خۆشەویستی تۆ ئەوەمان خۆش دەوێت کە خۆشی دەوێیت ، و بە دژایەتی تۆ بۆیان دژایەتی ئەوە دەکەین کە دژی تۆ بێت و پێچەوانەت کاربکات" ، هاتووە لە موجاهیدەوە کە لە تەفسیر و واتای ئایەتی : (وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنْتُ) (واتا : منی پیرۆز کردووە لەهەرکوێ بم) ، موجاهید دەڵێت : (واتا سودبەخش بۆ خەڵک) ، و باشترین سودبەخشین بریتیە لە ســــودبەخشــــینی ئەو دونیا ، هەرکەس دەیەوێت کە باوەڕەکەی نوێ ببێتەوە با بانگەواز بۆ خودا بکات و خەڵکی تر فێر بکات.

لە بەرەکەتی ڕێنماییکار ئەوەیە کە خەڵک لە خراپە و خراپەکاری بەدوور دەخات ئەگەر تەنانەت بە دڵیشــــی بێت ، وەک حەزرەتی پێغەمبەر (ســــەڵەوات لەســــەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (هەرکەسێک خراپەیەکی بینی با بەدەستی بیگۆڕێت ، ئەگەر نەیتوانی بە زمانی ، ئەگەر نەیتوانی بە دڵی ، ئەوەش لاوازترینی باوەڕە) .

ڕێنوێنیکار نزاکانی قبوڵکراوە :

ئەم ئومەتە موحەمەدییە پیرۆزە بووە بە باشترین هەتا ڕۆژی قیامەت لەبەر دوو کاری پیرۆز دوای ئیمان هێنان بە خودا کە ئەوانیش فەرمانکردنە بە چاکە و ڕێگری کردنە لە خراپە ، خودای گەورە دەفەرموێت : (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ) (واتا : ئێوە چاکترین ئومەت بوونە کە دەرکەوتوون بۆ خەڵک فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکەن و باوەڕتان بە خودا هەیە) ، بەڵکو هەموو تاکێک لە ئومەتە ڕەحم پێکراوە ئەگەر هاتوو ئەم سیفەتەی هەبوو و ئەم خوڕەوشتەی هەڵگرت ئەوا دەبێتە یەکێک لەو باشترینانە و دەبێتە بە تاکێک لە باشـــترین ئومەت کە دەرکەوتووە بۆ خەڵک ، وەک حەزرەتی شـــێخ ســـوڵتان خەلیفە موحەمەدی موحەمەد کەسنەزانی (هیمەتی حازر بێت) دەیفەرموێت ، فەرمانەکە هەتا ئەم ئاست و سنوورە نییە ، بەڵکو خودای گەورە فەرمانی بە بانگهێشـتلێکراوەکان کردووە کە بەدەم بانگەواز و یارمەتی بانگەوازکار بچن ، فەرمووی : (أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ) (واتا : بەدەم بانگەوازی بانگەوازکار بۆ خودا بچن) ، بانگەوازی بانگەوازکاریش هەر بانگەوازێکە بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی ، خودا دەفەرموێت : (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْـــتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُـــولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ) (واتا : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بەدەم بانگەوازی بانگەوازکار بۆ خودا و پێغەمبەر بچن ئەگەر بانگی کردن بۆ ئەوەی کە زیندووتان دەکاتەوە) ، حەزرەتی پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (هەرکەس فەرمان بە چاکە بکات و ڕێگری لە خراپە بکات ئەوا جێنشینی خودایە لەسەر زەویدا ، و جێنشینی کتێبەکانیەتی ، و جێنشینی پێغەمبەرەکەیەتی).

هەروەها خودای گەورە قبوڵکردنی نزای بانگەوازکاری لەخۆ گرتووە ، بانگەوازکار بۆ خودا (ڕێنماییکار) نزای قبوڵە وەک لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە : (أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ) (واتا : نزای بانگەوازکار قبوڵ دەکەم کاتێک داوام لێ بکا) ، ئەمەش لە بەرهەمی بانگەواز و ڕێنماییکاریە و بەرەکەتەکەیەتی.

ڕێنمایی و ســـەرکەوتن و هیدایەت لە بەرهەمی بەدەمەوەچوونی بـانگەوازکـاری ڕێنمـاییکـارە ، خودا دەفەرموێت : (فَلْيَسْـــتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُـــدُونَ) (واتا : با بەدەم بانگەوازەکەم بێن و باوەڕم پێ بهێنن بۆ ئەوەی بەهۆش خۆیان بێنەوە) ، وازهێنان لە ئیرشـــاد دەبێتە هۆی گیرانەبوونی نزاکان چونکە حەزرەتی پێغەمبەر (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەمـاڵەکەی) دەفەرموێت : (ئەی خەڵکینە خودا دەفەرموێت فەرمـان بە چاکە بکەن وڕێگری لە خراپە بکەن پاشان نزا بکەن ئەگەرنا وەڵام وەرناگرن).

حەزرەتی شـــێخ ســـوڵتان خەلیفە موحەمەدی موحەمەد کەســـنەزانی (هیمەتی حازر بێت) دەفەرموێت : (ڕێنماییکردن پاداشـــتێکی گەورەی هەیە ، مورید پێویســـتە ڕێبەر و ڕێنماییکار بێت و ســـەرەتا لە چاککردنی خۆی و پەروەردەکردنی نەفسی دەست پێ بکات کە بیخاتە سەر ڕێگای ڕاست و چاک ، پاشان ڕێنمایی خێزانەکەی بکات و دواتریش خەڵک).

ڕێنماییکار خۆشەویستی خودا و جێنشینەکەیەتی :

حەزرەتی پێغەمبەر (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (ئایا باســـی خەڵکانێکتان بۆ بکەم کە نە پێغەمبەرن و نە شەهیدن ، بەڵام ڕۆژی قیامەت پێغەمبەران و شەهیدەکان ئیرەیی بە پێگە و پلەکەیان دەبەن ، کە خودای گەورە پێیانی دەبەخشـــێت کە لەســـەر پێگەی نورین ببن) ، پرســـیان : کێن ئەوانە ؟ ، فەرمووی ( ئەوانەی کە خودا خۆشـــەویســـت دەکەن لەلای بەندەکانی ، بەندەکانیش خۆشـــەویســـت دەکەن لەلای خودا ، کە بەســـەر زەوی دەڕۆن ئامۆژگاریکارن) ، پرسـیمان : تێدەگەن کە خودا لای بەندەکانی خۆشـەویسـت دەکەن ، بەڵام چۆن بدەکان خۆشـەویسـت دەکەن لەلای خودا ؟ فەرمووی : ( بە خۆشـــەویســـتی خودا فەرمانیان پێ دەکەن و ڕێگریان لێدەکەن لە خراپە) ، واتا ئەوەی کە خودا پێی ناخۆشـــە خەڵکی لێ دەپارێزن بەمەش کە گوێڕایەڵی خودا بکەن دەبن بە خۆشـــەویســـتی خودا ، ئەمەش چونکە فەرمانکردن بە چاکە وەک ئەنجامدەرەکەیەتی.

پاداشتی وازهێنان لە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە :

لە باشترین بەڵگەکان لەسەر گشتگیری ئەرکی ڕێنوێنی کرد بریتیە لەو سزایەی کە ئەو ئومەتە توشی دەبێت کە فەرمان بە چاکە نەکات و ڕێگری لە خراپە نەکات کە هەموویان دەگرێتەوە لە گەورە و بچوک و زانا و نەزان ، لە پیاو و ئافرەت بەهەمان ئاست و شێوە ، وەک حەزرەتی پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (خودای گەورە فەرمانی کرد کە گوندێک سزا بدرێت ، فریشتەکان پەشۆکان ، فەرمووی : فڵان بەندەیان تێدایە ، فەرمووی : با گوێم لە ناڵە و هاواری بێت ، چونکە ڕووی گرژ نەکردووە و هەڵوێستی نەبووە بەرامبەر بەو حەرامانەی ڕوویانداوە لەبەردەمی) ، واتـا : ڕووی نەگۆڕاوە بۆ تورەیی لە پێنـاو خودادا ، هەروەهـا حەزرەتی پێغەمبەر (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (خودا ســـزای هەندێک نادات بەهۆی تاوانی کۆمەڵێک ، هەتاکوو ئەو ئاســـتەی کە دەبینێت خراپەکاری لەبەردەم ئەو هەندێ کەسە دەکرێت و دژی ناوەستنەوە لەکاتێکدا لە توانایان هەیە دژایەتی بکەن).

ئیبن عەباس ڕەزای خودای لەسەربێت سەبارەت بە فەرمایشتی خودا : ( وَلَوْلا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ) (واتا : ئەگەر خوا هەندێک بەڵای سەر خەڵک بەهۆی هەندێکەوە لانەبات) دەفەرموێت : (خودا بەڵا لەسەر ئەو کەسە لادەبات کە نوێژ ناکات بەهۆی ئەو کەسەی نوێژ دەکات ، و لەسەر ئەو کەسە لایدەبات کە حەج ناکات بەهۆی ئەو کەسەی حەج دەکات) ، وتم : (ئەمەش بەو ئەندازەیە دەبێت کە خودا خۆی بیەوێت ، لەوانەیە بیانهێڵێت هەتا لەناو دەچن ئەگەر هاتوو خراپەکاری زۆربوو لەناویان ، پاشان خودا زیندوویان بکاتەوە لەسەر ئەو نیەت و مەبەستانەی هەیانبووە) .

مالکی کوڕی دینار دەفەرموێت : (حەزمان چووە بۆ دونیا ، نە کەسێکمان فەرمانی چاکە بەوی تر دەکات ، نەش کەسێکمان ڕێگری لە خراپەی کەسێکی تر دەکات ، خوا پەنامان بدات لەسەر ئەمە ، دەبێ چ سزایەک دابەزێتە سەرمان ؟) پاشان ئایەتی : (وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ) (واتا لە شارەکەدا نۆ کەس هەبوون کە خراپەیان دەکرد و خۆیان چاک نەدەکردن) خوێندوە و فەرمووی : (دەبێ ئێستا لەهەر کۆمەڵێک چەنێک خراپەکار هەبێت کە خۆیان چاک ناکەن) ، هەروەها لە هەندێ لە پێشین هاتووە کە فەرموویانە : گوناهـ و تاوان ئەگەر شاراوەبوو تەنها زیان بە خاوەنەکەی دەگەیەنێت ، ئەگەریش ئاشکرای کرد ئەوە زیان بە هەمووان دەگەیەنێت).

حەزرەتی پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێت : (ئێوە حاڵتان چۆن دەبێت ئەگەر خێزانەکانتان خراپەیان کرد و گەنجەکانتان فاسق بوون و وازتان لە تێکۆشان لە پێناو خودا هێنا ؟) ، وتیان : ئەی پێغەمبەری خودا شتی وا ڕوو دەدات ؟ ، فەرمووی : (بەڵێ سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە و لەوەش خراپتر دەبێت) ، وتیان : لەوەش خراپتر چییە ئەی پێغەمبەری خودا ؟ ، فەرمووی : (حاڵتان چۆن دەبێت ئەگەر فەرمان بە چاکە نەکەن و ڕێگری لە خراپە نەکەن؟) ، وتیان : ئایا شتی وا ڕوودەدات ئەی پێغەمبەری خوا ؟ ، فەرمووی : (بەڵێ سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە و لەوەش خراپتر دەبێت) ، وتیان : ئەی لەوە خراپتر چییە ئەی پێغەمبەری خودا ؟ ، فەرمووی : (حاڵتان چۆن دەبێت ئەگەر چاکەتان بە خراپە بینی و خراپەتان بە چاکە بینی ؟ )، وتیان : ئایا شتی وا ڕوودەدات ئەی پێغەمبەر خودا ؟ ، فەرمووی : (بەڵێ سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە و لەوەش خراپتر) ، وتیان : ئەی لەوە خراپتر چییە ئەی پێغەمبەری خودا ؟ ، فەرمووی : (حاڵتان چۆن دەبێت ئەگەر فەرمان بە خراپە بکەن و ڕێگری لە چاکە بکەن؟) ، وتیان : ئایا ئەمە ڕوودەدات ئەی پێغەمبەری خودا ؟ ، فەرمووی : (بەڵێ سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە و لەوەش خراپتر دەبێت ، خودای گەورە دەفەرموێت : سوێند بە گەورەیی خۆم فیتنە و ئاشوبێکیان بۆ دەخوڵقێنم کەوا ئەوەی ژیر و دانایە سەرگەردان ببێت).

یاران سەریان سوڕما لەبەرامبەر ئەم قسەیەدا ، مێشکیان بەرگەی بیستنی شتێکی وەهای نەدەگرت ، چونکە ئەوا باوەڕیان بەوە هەبوو کە ئەم جۆرە ئاشوب و فیتنەیە ناکەوێتە ناو کۆمەڵێک کە ئەگەر تەنانەت یەک باوەڕداریشیان تێدا بێت ، هەر بۆیە بەردەوام پرسیان : (ئایا ئەمە ڕوودەدات) ، مانای ئەمەش ئەوەیە کە سەرشۆڕی و زەلیلی دەچێتە شوێنی سەربەرزی و پایەداری هەتاکوو ئەرکی ڕێنوێنی بەجێ نەهێنرێت.

پێغەمبەری خۆشەویستمان (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) بۆ ئومەتی ڕوون کردۆتەوە کەوا سزای پەیدابوو چییە و چۆنە کاتێک درک بە گرنگی و گەورەیی ئەم ئەرکە پیرۆزە نەکرێت ، لە سزاکانیشی ئەوەیە کە لە فەرمایشتدا هاتووە : حەزرەتی حوزەیفەی یەمانی (خودا لێی ڕازیبێت) دەگێڕێتەوە لە حەزرەتی پێغەمبەرەوە (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) کە فەرموویەتی : (فەرمان بە چاکە بکەن و ڕێگری لە خراپە بکەن پێش ئەوەی بانگەواز بۆ خودا بکەن ئەگەرنا وەڵام نادرێنەوە ، و پێش ئەوەی داوای لێخۆشبوون بکەن چونکە لێتان خۆش نابێت ، فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری لە خراپە گرنگترین شت و کارە).

لە ڕاستیدا ئێمە هەموومان پێویستە هەستین بە ئەنجامدانی ئەم ئەرکە پیرۆزە کە خودای گەورە ئێمەی هێناوەتە بوون لە پێناویدا ، کە ئەویش فەرمانکردنە بە چاکە و ڕێگری کردنە لە خراپە ، گەورەمان حەزرەتی عەلی (سەلامی خودای لەسەربێت) دەفەرموێت : (یەکەم شت لە تێکۆشان کە بیکەن بریتیە لە تیکۆشان بە دەستتان ، پاشان تێکۆشان بە زمانتان ، پاشان تێکۆشان بە دڵتان ، ئەگەر هاتوو دڵ چاکەی نەزانی و خراپەی لا خراپ نەبوو ئەوا تێکۆشانی سەراوژێر کردووە).

ئاکارەکانی ڕێنوێنیکاری سەرکەوتوو چییە؟

بۆ ئەوەی ڕێنوێنیکار سەرکەوتوو بێت لە ئەرکە پیرۆزەکەی ، پێویستە کۆمەڵە ئاکار و ڕەوشتێکی هەبێت لەم ئەرکە پیرۆزەدا ، لەوانەش :

1. پێویستە لۆژیکی بێت و واقیع ببینێت :

ڕێنوێنیکار پێویستە مرۆڤێکی لۆژیکی بێت ، جا لە هەڵسەنگاندنی بۆ ڕووداوەکان یاخود تێگەیشتنی لەوانەی قسەی لەگەڵ دەکەن ، ئەو هەمیشە دادەبەزێتە ئاستی تێگەیشتن و فامی ئەوان ، حەزرەتی پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (ئەی خەڵکینە ئێمە وەها فەرمانمان پێ کراوە کە بە ئەندازەی

مێشـــکی خەڵک گفتوگۆیان لەگەڵ بکەین) ، و پاشـــان بەوەی دەیەوێ قایلیان دەکات ، بەوەی کە قســـەکانی قبوڵکراو دەبن و لۆمە ناکرێت ئەوەش بەهۆی ئەوەی قســـە و کرداری لەگەڵ لۆژیک و واقیع بوون دەبێت ، وا نەزانرێت ئێمە بەدوای ڕێنماییکارێک دەگەڕێین کە ڕەفتاری وشـــک بێت ، بەڵکو دەمانەوێت ڕەفتار و گوفتاری لۆژیکی بێت ، و لە ســـنووری مەعقولیەت و واقیعەت بێت ، چونکە ڕێنماییکاری بانگەوازی ئەو کەســـەیە کە بووە بە ژیر و وریا بەمەش ڕێنمایی کەسانی تر دەکات بۆ ڕێگای ڕاست ، و ڕێگەی هیدایەت بە مێشکێکی دانا کە خەڵک باوەڕی پێ بکەن ، و لەبەر دەرخستنی پێشەکیەکی جوان بۆیان و دەرئەنجامە چاکەکەشی دەبینێتەوە ، بەوەی بە ئەندازەی مێشکیان گفتوگۆ و مامەڵەیان لەگەڵ دەکات .

2. پێویستە لێبوردە و دڵفراوان بێت :

خودای گەورە دەفەرمویت : (خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ) (واتا : ڕێگای لێبوردن بگرە بەرز و فەرمان بە چاکە بکە و پشـــت لە نەفام و نەزانان بکە)، و حەزرەتی پێغەمبەر (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (من نێردراوم بە ڕەوشـــت و ڕەفتاری جوانەوە) ، هەروەها فەرموویەتی : (خودا فەرمانی پێکردووم کە ڕەفتار و ڕەوشتی جوان بنوێنم لەگەڵ خەڵک وەک چۆن فەرمانی بە فەرزەکان پێکردووم) ، کەسی ڕێنوێنیکار دڵەکان بۆخۆی ڕادەکێشێت و لێبوردەیە ، لەڕاستیدا جوان ڕەفتاری بریتیە لە دوورکەوتنەوە لە ئازاردان و ئەگەری ئازاردان ، لێبوردەیی بریتیە لە ســینە فراوانی و لێبوردەیی بریتیە لە مێشــک کراوەیی و فراوان بینین ، نەوەک دابەزین و خۆکەمکردنەوە لە بانگەواز بەهیچ شێوەیەک.

ئەو فەرمایشــتەشــی کە پێغەمبەر (ســەڵەوات لەســەر خۆی و بنەماڵەکەی) فەرموویەتی بە کافرەکانی مەککە ســەرەڕای ئەوەی لەلایەن ئەوانەوە لە شــار خۆی و ئەوانەی ئیمانیان هێنابوو دەرکران ، و ســەرەڕای ئەوەی ئازاردراون ، بەڵام بەوپەڕی لێبوردەییەوە فەرمایشــتی فەرموو ، پرســیاری کرد (ســەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) : (ئێوە پێتان وایە من چیتان پێدەکەم ؟) ، وتیان : کارێکی چاک چونکە تۆ برایەکی چاک و برازایەکی چاکیت ، ئەویش ئەوەی پێیان فەرموو کە حەزرەتی یوسف بە براکانی فەرموو : (قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ ۖ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ ۖ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ) (واتا ئەمڕۆ لۆمەتان لەســـەر نییە خودا لێتان خۆش دەبێت و ئەو بەخشـــندەیە) ، لێرەدا حەزرەتی یوســـف لێبوردەیی بەرامبەر براکانی نیشـــان دا لەکاتێکدا حەزرەتی پێغەمبەر (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) بەرامبەر بە دوژمنەکانی نیشـــانی دا ، بەمەش لێبوردەیی حەزرەتی

پێغەمبەر لە لێبوردەیی حەزرەتی یوسـف گەورەتر و فراوانتر بوو ، دەگێڕنـەوە کە کەسـێک بەردی گرتە مالکی ئەشتەر ، خەڵکیش لۆمەی ئەو کەسەیان کرد کە بەردەکەی هەڵدابوو ، بۆیە ئەویش بەڕێکەوت تا بچێت داوای لێبوردن بکات ، پرســـیاری کرد کە لە کوێیە ؟ وتیان مالکی ئەشـــتەر لە مزگەوتە . کاتێک هاتە لای داوای لێبوردنی کرد ، مالک فەرمووی : هیچت لەسەر نییە ، من هاتمە مزگەوت تا نزات بۆ بکەم

3. پێویستە کەسێکی لەسەرخۆ و چاونەترس بێت لە ئەرکەکەی :

خودای گەورە دەفەرموێت : (یَا یَحْیَىٰ خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ) (واتا ئەی یەحیا بە گرنگیپێدان و جدێتیەوە ئەم کتێبە وەربگرە) ، بەم ئایەتە پیرۆزە خودای گەورە بەهەمان شـــێوە داوا لە نەفســـی ڕێنوێنیکار دەکات کە بتوانێت بەرامبەر ئاســـتەنگیەکان بوەســـتێتەوە ، و ئەوانەی لەســـەر ڕێگای هەڵە و چەوتن ، ڕێنوێنیکار لە ڕێگای بانگەواز بەردەوام دەبێت ، بەمەش باوەڕ و بنچینەکانی لە ناخیدا دەچەسـپێت ، حەزرەتی پێغەمبەر (ســەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (پلە و پێگە و هەیبەتی کەسێک با وات لێنەکات کە حەق بڵێیت ئەگەر بینیت یاخود بیستت) ، بۆیە بانگەواز سەرەڕای ئەوەی پاداشتێکی گەورەی هەیە و ڕێگایەکە بۆ بە پتەو مانەوە ، و پارێزگاری لە گەڕانەوە و بەزەیی پێهاتنەوە ، چونکە ئەوەی کە هێرش دەکات پێویســـتی بە بەرگری نییە ، خوداش لەگەڵ بانگەوازکارانە پتەویان دەکات و کاریان ئاســـان دەکات ، خودای گەورە دەفەرموێت : (قُلْ هَٰذِهِ سَـــبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِـــيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي) (واتا : ئەی پێغەمبەر پێیان بفەرموو کە ئەمە ڕێگای منە لەســـەر چاوکراوەیی و وریایی بانگەواز بۆ خودا دەکەم من و ئەوانەی شـــوێنم کەوتوون) ، بانگەوازکار وەک پزیشک وایە دژی نەخۆشیەکەیان دەوەستێتەوە بەو شارەزایی و زانستەی هەیەتی و بە دژایەتی نەخۆشیەکەی کە لە خەڵکی تردا هەیە بەم شێوەیە پارێزراو دەبێت لە چاو کەسانی تر لە توشبوون پێی ، پێویستە بزانیت کە مەدەد و هـاوکـاری شـــێخەکەت لەگەڵتدایە لەهەرکوێ بیت مـادەم لە ئەرکی ڕێنوێنی کردن دایت ، بە هێزی کاریگەری دروستکردن لەسەر بیسەران و بەهێزبوونی بەڵگەکان هاوکارت دەبێت ، خودای گەورە دەفەرموێت : ( يَا مُوسَىٰ لَا تَخَفْ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ الْمُرْسَلُونَ) (واتا : ئەی موسا مەترسە ، نێردراوەکانی من ناترسن)

4. پێویستە ڕەوشتی جوانی هەبێت :

حەزرەتی پێغەمبەر (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) فەرمانمان پێ دەکات بە ڕەوشـــت جوانی ، کە دەفەرموێت : (چاکترینتان باشترینتانە لە ڕووی ڕەوشتەوە) ، و حەزرەتی پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و

بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (زەردەخەنەت بە ڕووی براکەتدا چاکەیە بۆت ، فەرمانکردنت بە چاکە و ڕێگریت لە خراپە چاکەیە بۆت ، ڕێنوێنی کردنی کەسێک لە ڕێی گومڕاییدا بێت چاکەیە بۆت ، بوونت بە چاوساغ بۆ کەسێک کە ڕێی ڕاستی ونکردووە چاکەیە بۆت ، کە بەرد و دڕک و ئێسک لە ڕێگا لا دەبەیت چاکەیە بۆت ، بەتاڵکردنی گۆزەکەت بۆناو گۆزەی براکەت چاکەیە بۆت) ، هەموو ئەم فەرمان و چاکانە ئایا تەنها بۆ زانینە ، یاخود بۆ کارپێکردنە ؟ و ئەگەر جێبەجێمان کرد ئایا پەیوەندی هەیە بە زیادکردنی باوەڕ لە دڵەکانمان یاخود نا ؟ ئەگەر پەیوەندی نەبێت بە باوەڕەوە ، ئیتر سوودی چییە ؟ بۆچی باسکراوە ؟ بۆچی ئاینەکەمان فەرمانی پێکردووە و جەختی لەسەر کردۆتەوە ، وەڵامی ئێمەش ئەوەیە چونکە پێویستمان پێیەتی لە ژیانماندا ، ئاین مامەڵەیە ، پتەوبوونی باوەڕت لە ئەم سێ مامەڵەیە وەرگرە کە بابەتێک نەماوە لەخۆیان نەگرتبێت ، بۆنمونە کاتێک دەفەرموێت : (لە خودا بترسە لەهەرکوێ بویت) ، ئەمە مامەڵەیە لەگەڵ دروستکراوانی خودا ، کە دەفەرموێت : ( کە خراپەت کرد بە دوایدا چاکەیەک بکە دەیسڕێتەوە) ، کە ئەمە بریتیە لە مامەڵەکردنت لەگەڵ خۆت (واتا نەفست) کە گەورەترین دوژمنتە . و کاتێک دەفەرموێت (بە ئاکار و ڕەفتاری جوان بجوڵێرەوە لەگەڵ خەڵک) ، لێرەدا مامەڵەیە لەگەڵ ئەو خەڵکانەی کە تێکەڵیان دەبیت و سەبر لەسەر ئازاریان دەگریت ، ئەوە باشترە لەو کەسەی کە تێکەڵیان نابێت ، و سەبر ناگرێت لەسەر ئازاردانیان ، زەردەخەنە بکە بە ڕووی خەڵکدا بەمەش باوەڕت زیاد دەکات ، شتی ئازاربەخش لە ڕێگای خەڵک لابدە ، و بزانە کە هەرکەس ئەمە بکات و سوپاسی خودا بکات ئەوا لێی خۆش دەبێت ، بۆیە سوپاسی خودا بکە و هەست بە لێخۆشبوونی خودا بۆت بکە لە ڕەفتارە جوانەکانیش درۆ نەکردنە ، درۆش پلە و پێگەی جیاوازە ، بەرزترینیان زۆرترین زیانی هەیە ، کە بریتیە لە بەسەر نەبردنی پەیمان وبەڵێن ، بۆیە هەر شتێک پەیوەندی بە کۆمەڵگاکەت هەیە گرنگی پێ بدە و ببە بە تاکێکی بەسود و چالاک ، کاربکە لە دامەزراوەکانی و چالاکیەکانی ، هەموو ئەمەش لەپێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا ، هەست بەو بەدەستهێنانی ڕەزامەندیە بکە لە دڵتەوە ، بۆ خوێندکارانی زانکۆکانیش دەڵێین : خوێندکارێکی گرجوگۆڵ و تێکۆشەر ببە و بەشداری لە هەموو چالاکیەکانی زانکۆکە بکە ، هەوڵبدە بەشداری لە کۆنفرانس و سیمینار و وۆرکشۆپ و پێشانگاکان بکەیت ، تۆ کە ئەندازیارێکی زیرەکیت یاخود پزیشکێکی لێهاتوو ، کاتێک دەبیتە ڕێنوێنیکاریش و بانگەوازی خەڵک بۆ ڕێگای چاکە دەکەیت ئەوە دەبیتە چاکێکی بەسود بۆ کۆمەڵگاکەت .

حەزرەتی سـوڵتان خەلیفە سـەید شـێخ موحەمەدی موحەمەد کەسـنەزانی (هیمەتی حازر بێت) دەفەرموێت :

(مورید پێویسـتە ڕەوشـت و ئاکاری پێغەمبەری (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) هەبێت ، ڕەوشـتەکەی ڕەوشـتی قورئان بێت ، وەک شـێخ ئیبن عەرەبیش دەفەرموێت کەوا ئەو قورئانێکی وتەبێژ بووە ، بۆیە ئەی مورید پێویسـتە ڕەوشـت و ڕەفتاری پێغەمبەرت (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) هەبێت ، و ڕێنوێنی بکەیت بۆ ڕێگای چاکە و چاکەکاری ، ئەو زمانەی خودا پێتی بەخشیوە ئەگەر ڕێنوێنیت بکات بۆ ڕێگای ڕاست ئەوا شمشێری حەقە ، ئەگەریش زمانت پێچەوانەی ئەوە بوو ئەوا شمشێری شەیتانە)

5. پێویستە کەسەکە موخڵیس بێت و نەرمونیان بێت :

موخڵیس بوون بریتیە لەو ڕوحەی کە لە کردەوەکـانـدا پەیدا دەبێت و دڵەکـان زینـدوو دەکـاتەوە و بریتیە لەو ڕوحەی کە بانگەوازەکە پیرۆز و کاریگەر دەکات ، پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (خەڵک هەموویان مردوون تەنها زاناکان نەبن ، زاناکانیش هەموویان لەناو دەچن تەنها ئەوانە نەبن کە کار بە زانسـتەکەیان دەکەن ، ئەوانەشـی کە کار بە زانسـتەکەیان دەکەن هەموویان خنکاون تەنها ئەوانە نەبن کە موخڵیسن ، موخڵیسەکانیش لە مەترسیەکی گەورەدان) ، و لە ماناکانی ئارامگرتنیش کە بریتیە لە ژیری و پەلە نەکردن ، زارعی عبدی کە لە وەفدی عبدالقیس بوو دەگێرێتەوە و دەڵێـت : کـاتێـک هـاتین بۆ مەدینە ، لە قافڵەکانمان دابەزین و ڕۆیشـتین دەسـت و پێی پێغەمبەرمان (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) ماچ کرد ، منذق الاشـنج چاوەڕێی پێغەمبەری (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) کرد هەتاکو هات ، و پێی فەرموو : (تۆ دوو ئاکارت تێدایە کە خودا خۆشـی دەوێت : ژیری و لەسـەرخۆیی) ، وتی : ئەی پێغەمبەری خودا ئایا ئەم دوو ئاکارە خۆمان ئەنجامی دەدەین یاخود خودای گەورە لەسـەر ئەو ئاکارە منی دامەزراندووە ، حەزرەت فەرمووی : (بەڵکو خودای گەورەی تۆی دامەزراو کردووە لەسەری) ، وتی : سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە دوو ئاکاری پێ بەخشیوم کە خودا و پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێت.

نەرمونیانیش ، خودای گەورە دەفەرموێت : (وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنَاً) (واتا : وتەی چاک و جوان بە خەڵک بڵێن) ، و نەرمونیانیش لەگەڵ هەر شـتێک بێت دەیرازێنێتەوە و جوانی دەکات و لەگەڵ هەر شـتێکیش نەبێت تێکی دەدات و دەیشـێوێنێت ، پێغەمبەر (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (خودا نەرم و نیانە ، حەزی بە نەرمونیانیە و پێی خۆشە ، لە پێناویدا شتانێک دەبەخشێت کە بە توندوتیژی نایبەخشێت)

لە ئیمامی حەسەن و ئیمامی حوسەین (سەلامی خودا لەسەر خۆیان و باوک و باپیریان) دەگێرنەوە کە بەلای کەسێک تێپەڕین کە دەستنوێژەکەی بەهەڵە دەگرت ، یەکێکیان بە براکەی خۆی وت : وەرە با ڕێنوێنی ئەم بەتەمەنە بکەین ، وتیان : مامە دەمانەوێ لە بەردەستت دەستنوێژ بگرین بۆ ئەوەی بزانین کاممان دەستنوێژی دروست دەگرێت و کاممان هەڵە ئەنجامی دەدات ، بۆیە لەبەردەم پیاوە بەتەمەنەکە ئەنجامیان دا ، کاتێک تەواو بوون ، وتی : "وەڵاهی ئەو کەسەی لە دەستنوێژەکە نازانێت خۆمم ، ئێوە هەردووکتان زۆر بە تەواوەتی دەستنوێژتان گرت" ، بۆیە پیاوە بەتەمەنەکە سودی لە هەردووکیان بینی بەبێ ئەوەی هیچ لۆمەیەک بکرێت یاخود قسەی پێ بوترێت ، بۆیە پێویستە لەسەر ڕێنوێنیکار کە بەو شێوەیە بێت ، ئەگەر بەو شێوەیە بوو ئەوا خودا پاڵپشت و پشتیوانی دەبێت و ڕێگای بۆ ڕۆشن دەکاتەوە .

6. ئارام بگرێت لەسەر ئازاردان لە پێناو خودادا :

ئارام گرتن لەسەر ئازاردان سونەتێکی پیرۆزە کە پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ڕوخساری پیرۆز و ناوچەوانی پیرۆزی بریندارکرا بە بەردی ئەو کەسانەی دەیویست هیدایەتیان بدات ، حەزرەتی جبریل دادەبەزێتە خوارەوە و داوای مۆڵەت دەکات کە دوو شاخ لەیەک بدات بەسەر ئەو کەسانەدا ، بەڵام پێغەمبەری ڕەحمەت (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵە بەڕێزەکەی) فەرمووی : (بەڵکو داواکارم کە خودای گەورە لە پشتی ئەمانە کەسانێک بهێنێتە دونیاوە کە خودای تاک و تەنها بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن)

هەندێک لە پێشین منداڵەکانیان ئامۆژگاری دەکرد و دەیانفەرموو : "ئەگەر یەکێکتان ویستی فەرمان بە چاکە بکات ئەوا با سەرەتا خۆی لەسەر ئارامگرتن دابمەزرێنێت ، با متمانەی بە پاداشتی خودا هەبێت ، هەرکەسێک متمانەی بە پاداشتی خودا هەبێت گوێ بە ئازاردان نادات ، بۆیە لە ڕەوشت و ئاکاری ڕێنوێنیکار بریتیە لە دامەزراندنی نەفس و خودی خۆی لەسەر ئارامگرتن ، هەر بۆیە خودای گەورە ئارامگرتنی بەستووەتەوە بە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە و هەر بۆیە خودای گەورە ئاماژە بە فەرمایشتی لوقمانی حەکیم دانا دەکات و دەفەرموێت : (يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا أَصَابَكَ) (واتا : ئەی ڕۆڵەکەم نوێژ ئەنجام بدە و فەرمان بە چاکە بکە و ڕێگری لە خراپە بکە و ئارامی بگرە لەسەر ئەوەی بەسەرت دا دێت) .

حەزرەتی شێخ ئەبولحەسەنی شازلی (قدس الله سره) دەفەرموێت : " سونەتی خودا وەها بووە لەناو پێغەمبەران و پیاوچاکان و دۆستانی کە لە سەرەتادا بوونەوەرانیان بەسەردا زاڵ بکات ، بەڵام لە کۆتاییەکەیدا ئەوان ببنە دەوڵەت و سەرکەوتن و سەرفرازی لە کۆتاییدا بۆ ئەوان بێت ، ئەگەر بە تەواوەتی ڕوو بکەنە خودا ، ئەوەش چونکە موریدی پەیڕەوکار ناتوانێت موخڵیس بێت و بەرەو ڕووی ڕەزامەندی خودا بڕوات ئەگەر هاتوو ئارامی نەگرت لەسەر ئازاردانی لەلایەن بونەوەرانەوە ، ئەگەر لە دوای ڕێنوێنی کردنی بونەوەران گەڕایەوە و ژیری پێوە دیار بوو و لێبوردەیی و داپۆشین و ئارامگرتن لەسەر ئازاردان و ڕەزامەند بێت بەوەی بەسەریدا دێت لەسەر دەستی بەندەکانی خودا ، ئەوا خودا پلە و پێگەی بەرز دەکاتەوە لەناو بەندەکانی و بەمەش ڕۆشنابەخش و نووربەخش دەبێت ، دەبێتە جێگەداری پێغەمبەران لەبەرامبەر ئارامگرتنی بەرامبەر بە ئازاردانی لەلایەن بونەوەرانەوە ، خودای گەورە دەفەرموێت : ( وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا ۖ وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ) (واتا : کەسانێکمان تێیاندا دەرخست کە بە فەرمانی ئێمە خەڵکیان ڕێنوێنی دەکرد و ئارامیان دەگرت و متمانەیان بە فەرمایشتەکانمان هەبوو) ، و دەفەرموێت : (وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا حَتَّىٰ أَتَاهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَاءَكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ) (واتا : نێدراوانی پێش تۆ بە درۆ خرانەوە بەڵام ئارامیان گرت لەسەر ئەو بەدرۆخستنەوەیە و ئازاردران هەتا خودا سەرکەوتووی کردن و فەرمایشتەکانی خودا گۆڕانکاریان بەسەر نایەت و ئەوەتا لە باس و بەسەرهاتی نێدراوانت پێ گەیشتووە کە چیان بەسەرهاتووە".

ئەمەش چونکە کامڵ بوون پێویستە هەردووکیانی تێدا بێت لەم دووانە ، یان ئەوەتا خودا سەیری دڵی دەکات و دڵی ڕۆشن دەکات بەمەش کەسەکە ڕوو دەکاتە خودا و گوێ بە بەندەکانی نادات ، یانیش خودا سەیری دڵی ئەوان بکات و ببینێت بەندەی خودان ، بەمەش ڕێز و پایەداری دەدات بە گەورە و ڕابەرەکەیان کە ڕێنوێنی کردوون ، بۆیە زانرا کە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی شوێنی پێغەمبەران (سەلامی خودایان لەسەربێت) و پیاوچاکان و زانایان دەکەوێت ئازار بدرێت وەک ئەوانەی پێش خۆی ، بوهتانی بۆ بکرێت وەک بۆ ئەوان کراوە ، بۆ ئەوەی وەک ئەوان ئارام بگرێت ، ببێتە مایەی ڕەحمەت بۆ بونەوەران.

7. ڕێنوێنیکار گرجوگۆڵ و بەتوانایە :

**ئەمەش بریتیە لە هیمەت و نووری شـێخەکەت (هیمەتی حازر بێت) ، کە ئەگەر هەتبێت نەسـیمی باوەڕداریت بەسەردا دەڕژێت ، تەقوا و خودا پەرستیت زیاد دەکات ، خودی خۆتیش بە نووری ڕووح دەگەشێیتەوە ، دەبیتە کەسـێکی چاک ، و ئیمانداریکی لەخوا ترس ، و موسـوڵمانێکی چاکەکار و کەسـێکی موخلیس ، بەڵکو ئەگەر هاتوو ڕۆیشـیت بە ڕێگادا ڕۆیشـتنەکەت هەیبەت و شـکۆی دەبێت ، ئەگەریش قسـە بکەی قسـەکانت کاریگەر دەبن ، ئەگەریش کـار بکەیـت ئـەوا کـارەکـانـت دەبنـە مـایـەی چـاولێکردن ، ئـەگەر دەربکەویت دەرکەوتنەکەت سەرنجیان ڕادەکێشێت ، ئەگەریش سەیر بکەیت ئەوا تێروانینەکانت نووربەخش دەبن .**

**ئەم نووربەخشـینەش ئەگەر بە چاکی هەوڵ بۆ بەدەسـتهێنـانی بـدرێت ، و خۆتی پێ پەروەردە بکەیت و بەرەنگاری حەزەکانی نەفسـت ببیتەوە ، ئەوا دەبنە سـەرچاوەکانی بەخشـینەکانی کەسـی ڕێنوێنیکار ، و سـەرچاوەی ڕوح گەشـانەوە ، و پێگەی ڕێنوێنی پەروەردەکردنەکان ، بەڵکو دەبێتە وزەی دروستکەر بۆ درک کردن بە ناخی خۆی ، هەروەها سـەرزەنشـتکردنی نەفس و بەڕێکەوتنی بۆ ئیرشـاد ، بەڵکو بزوێنەری یەکەمە بۆ هەڵگرتنی بەرپرسـیاریتی ، و باشـترین ئـاراسـتەکارە لە ڕەفتاریدا بەرەو ڕێگـای ڕاسـتبوونەوە و وشیارکەرەوەی هەرە گەورەیە لە هەڵە و ڕێگای چەوت .**

**ئەگەر هـاتوو کەسـی ڕێنوێنیکـار ئەو پێگە ڕووحیە بەهێزەی نەبوو ئەوا ژیـانی بەتـاڵ دەبێت لە کـاریگەری دروستکردن و بەخشین ، دەکەوێتە ناو دەریای خۆپەرستی و لوتبەرزی ، نوقم دەبێت لە قوڕی خۆبەزلزانین و نەفس پەرستی ، هەوڵەکانی ئەوکات بۆ بانگەشـەکردنی خەڵک دەبێت بۆ خۆی نەک بۆ خودا ، شـان و شـکۆ بە خۆی دەبەخشـێت نەوەک ئیسـلام ، کار بۆ دونیا دەکات نەوەک دواڕۆژ ، بۆ بەدەسـتهێنانی پێگە ڕووحییە بەهێزەکە پێویسـتە ڕیگای پێ بدرێت و مۆڵەتی ڕێنوێنی وەربگرێت لەو شـێخە کامڵ و پێگەیشـتووانەی کە مۆڵەتیان پێ دراوە لە پێغەمبەرەوە (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) و ئەوانەی بە دوای ئەودا هاتوون لە زنجیرەیەکی نەپچڕاو و یەک بە دوای یەک وەک شێخەکانی تەریقەتی پیرۆزی عەلیی قادری کەسنەزانی کە هەریەکێکیان شێخی سەردەمی خۆی و غەوس و فەریادڕەسی زەمانی خۆی بووە و پەروەردەکار و ڕێنوێنیکار و فێرکار بووە.**

8. ڕێنوێنکار ریکوپێک پۆشە – شیک پۆشە :

یەکەم شت کە سەرنجی بەرامبەرت ڕابکێشێت کاتێک کەسێک دەبینێت : جلوبەرگەکەیەتی ، ئەوە یەکەم پەیامە کە دەگاتە بەرامبەر پێش قسەکردن و ڕەفتار . جوانی دەرکەوتن و ڕێکوپێکی پۆشاک و خاوێنی تەنانەت ئەگەر سادەش بێت بە ڕێکخستنی کاریگەری دروست دەکات لەسەر خودی ڕێنوێنکار پێش ئەو کەسەی کە بانگهێشتی دەکات ، لەو فاکتەرانەیە کە متمانە بەخۆبوونی لەلا زیاد دەکات .

بۆچی مصعبی کوڕی عمیر (ڕەزای خودای لەسەربێت) نێردرا بۆ مەدینە لە جیاتی صەحابە شەرعزانەکانی تر ؟ ، پێدەچێت لەبەر ئەوە بێت کە لە ناو خەڵکی مەککە دا بە گەنجە جوان پۆش و شیک پۆشەکە ناسراوە ، یاخود بۆچی پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) هەستا بە ناردنی دحیەی کەلبی (ڕەزای خودای لەسەربێت) بۆ هەرقلی ئیمپراتۆری ڕۆم ، سەرەڕای ئەوەی کە لە جەنگاوەرەکانی بەدر نەبوو و یەکەم بەشداری ئەو لە جەنگ لەگەڵ پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) بریتی بوو لە ڕۆژی ئەحزاب ، بەڵام (دحیە) بەوە ناسرابوو لەناو صەحابەکان کە سیمایەکی جوانی هەبوو و تەنانەت حەزرەتی جبریل لەسەر شێوەی مرۆیی (دحیە) دادەبەزیە خوارەوە .

دەڵێین : سیما و دەرکەوتەی ڕێنوێنیکار هاوکارە بۆ دروستکردنی کاریگەری ، زۆرێک لە ڕێنوێنیکاران وەک کەسە ڕۆشنبیرەکان ناپۆشن لە پۆشاکدا ، سیما و پۆشاکیان پشتگوێ دەخەن ، تەنانەت لەوانەیە ببینیت کەسەکە ئەگەر لەوانەش نەبێت کە ڕیشیان بەردەدەنەوە ئەوا تەنانەت دەبینیت ڕیشیشی چاک ناکات ، یاخود پۆشاکێک دەپۆشێت بۆ چەند ڕۆژێک بەبێ شۆردنی ، یاخود بۆ چەند ڕۆژێک خۆی ناشوات ، هۆکارێکی مەعقولیشیان نییە بۆ ئەم کارەیان ، خەڵک لە ئەمڕۆدا لەگەڵ نەرم و نیانی قسەکانمان پێویستی بەوەیە کە پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ئەنجامی دەدا لەگەڵ وەفدە هاتووەکان ، کە خۆی جوان و ڕیکوپێک دەکرد بۆیان ، دەبینین خەڵک لە ئەمڕۆدا ئەگەر موسوڵمانیش بین ، بەڵام ماناکانی ئیسلام کە لەگەڵیان باسی دەکەین بەلایانەوە نامۆیە ، بۆیە پێویستە ئەو بەربەستە تێک بشکێنین لەڕێگای پۆشاکی جوان و ڕێکوپێکەوە ، گرنگیدانی زۆر بە پاکوخاوێنی و بۆنخۆشکردن بۆ ئەوەی بچینە دڵیانەوە ، بەبێ ئەوەی زیادەڕۆییەکە بچێتە ژێر باری ئەو زیادەڕۆییانەی لە شەرع قەدەغەن ، نێوەندگیری و مامناوەندی بوون لەهەموو کارێکدا شتێکی چاکە .

هەروەها سیمای کەسی بانگەوازکار و شیک پۆشیەکەی و پاکوخاوێنیەکەی دەبێتە مایەی باس و خواسی ناخی هەموو ئەو کەسانەی کە دەیبینن و گوێی لێ دەگرن ، نەفس بە سروشتی حاڵی خۆی سەرنجی دەچێت بۆ ئەو دیمەنانەی کە هەموو مرۆڤێک ئاواتی دەخوازێت بۆ خۆی کە بەو شێوەیە بێت.

9. ڕێنوێنکار سەیری خەڵک دەکات بەپێی ڕەوشتیان :

مرۆڤەکان دابەش دەبن لە ڕێگای بانگەوازدا بۆ سێ هۆز :

- خاوەنی ئاکار و ڕەوشتی نەفامی : کەسێکە کە هیچ کەسێک حەزی پێی نییە و خەڵک خۆیانی لێ بەدوور دەگرن لەبەر خراپی ڕەفتار و مامەڵە و ئاکاری ، خودای گەورە دەفەرموێت : ( وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلامًا) (واتا : ئەگەر نەزانەکان لەگەڵیان ئاخاوتنیان کرد ئەوا ئەوان وتەی چاک دەڵێن) ، و پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (خراپترینی کەسەکان لە پلە و پێگەدا لای خودا لە ڕۆژی دوایی ئەو کەسەیە کە خەڵک خۆیانی لێ بەدوور دەگرن لەبەر بەدڕەوشتیەکەی) ، نمونەی ئەمەش وەک ئەو کەسەیە کە پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەرحەقی فەرموویەتی : (خراپترین برای ناو هۆزەکەمان).
- خاوەنی ڕەوشت و ئاکاری بنەڕەتی : ئەو کەسەیە کە پابەند نییە بەڵام گوناهو تاوانەکانی ئاشکرا ناکات ، مرۆڤێکی کۆمەڵایەتیە ، پیاوەتی و مەردایەتی تێدایە و چاونەترسە ، لە پلەی دووهەمی گرنگی پێدان دێت ، کەسێکە کە دروستە دەربارەی بوترێت کە خاوەنی شکۆ و ڕاستگۆیی و چاکەکاریە ، سەرەڕای ئەوەی پابەند نییە بە زۆرێک لە حوکمە شەرعیەکان ، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ڕێزێکی زۆریان لێدەگرێت .

حەزرەتی موستەفا (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (پێغەمبەرانی پێش من کە خودا گەورە ناردوونی بۆ خەڵک ، چەندین هاوەڵ و یاوەر و کەسی گوێڕایەڵیان تێدا دەرکەوتووە ، کە کاریان بە فەرمایشتەکان کردووە و جێبەجێیان کردووە ، پاشان دوای ئەوان کەسانێک بەجێ ماون ، کە ئەوە دەڵێن کە ئەنجامی نادەن ، ئەوە دەکەن کە فەرمانیان پێ ناکرێت ، ئەوەی بە دەست بەرەنگاریان بوەستێتەوە بڕوادارە ، ئەوەی بە زمان بەرەنگاریان بوەستێتەوە بڕوادارە ، ئەوەی بە دڵ

بەرەنگاریان بوەســـتێتەوە بڕوادارە ، ئەگەرنا لە دوای ئەوە بە ئەندازەی دەنکۆڵە خەردەلێک بڕوایان نییە)

- خاوەنی ئاکار و ڕەوشتی ئیسلامی : ئەوانەن کە پەرستشەکان ئەنجام دەدەن و دەچنە مزگەوتەکانەوە ، ئەمانەش نزیکترین کەســـەکانن بۆ بانگەوازەکەی ئێمە ، هەوڵدانێکی زۆر پێویســـت نییە لەگەڵیان ، چونکە کەســـانێکن زۆر پابەندن بە حوکمە شـــەرعیەکانی ئاین و تێیدا دەکۆشـــن و هەوڵی ئەنجامدانی نوێژ و ڕۆژوو دەدەن ئەوەندەی بتوانن ، و وای دەبینن کە پێویستە ئەو حوکمە شەرعیانەی لەسەریان پێویســـتە ئەنجامی بدەن و جێبەجێی بکەن و ڕێزی لێ بگرن و بەپیرۆزی دابنێن ، بەڵام ئەوەی کە پێویســـتیانە بریتیە لە چوونە ناو دەریای باوەڕ بۆ ئەوەی جێبەجێکردنی حوکمە شـــەرعیەکان لە ڕووکەش و ناخیشدا ڕەنگ بداتەوە .

بە تایبەت ئەگەر ڕاســـتگۆ بوو لەگەڵ خۆیدا ئەوا لەبەرامبەر نەفســـی خۆی لاواز نابێت ، ڕوودەکاتە ڕاســـتیەکان ، عەقڵ و هزری زاڵ دەبێت بەســـەر حەز و ئارەزووەکانیدا ، هەروەها پەروەردەبوون لە منداڵیەوە لەســـەر ئیسلام و ژینگەیەکی پڕ لە باوەڕداری لە ماڵەوە یارمەتیدەرێکی ســـەرەکین بۆ کاتی پێگەیشتن و گەورەبوون .

نەوەک ئەوانەی ئێستا خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلامی سیاسی و هەندێک لایەنی توندڕەوی ئیسلامی لەمڕۆدا ، هەر بۆیە لە کۆتا هۆزەوە دەست پێدەکەین لەبەر نزیکبوونیان لە پابەندبوون بە ئاینەوە ، و لەبەر کەمی هەوڵ و ماندووبوونی پێویســـت لەگەڵیاندا ، و لەبەر دڵنیابوون لە ئەرێنێتی ئەنجامەکە لەگەڵیان زیاتر لە کەسانی تر ، بەڵام پێویستە کە بزانین :

کۆمەڵگەی ئاینپەروەران ، حاڵی وەک حاڵی هەموو مرۆڤەکانە ، چەندین جۆری جیاوازی تێدایە ، تیایدایە بەتەمەنە و تیایدایە گەنجە و هەشـــە منداڵە ، تیایدایە زانســـت و ڕۆشـــنبیری زۆرە ، هەیە مامناوەندە و هەیە سنورداره زانست و ڕۆشنبیریەکەی ، هەیە ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامی هەیە و هەیە زۆرێک لە ئاکارەکانی نییە ، هەیە ئارام دەگرێت و هەیە هەڵدەچێت ، هەیە لوتبەرزە و هەیە خۆبەکەمزانە ، هەیە بە پەرۆشە و هەیە ساردوسڕە ، هەیە سەرقاڵە بە ئاینەکەی و هەیە سەرقاڵە بە دونیا ، هەیە بیروباوەڕێکی تایبەتی هەیە و کەسانێکیش نیانە ... و بەم شێوەیە .

هەموو ئەم جۆرانە پێویستیان بە شێوازی بانگەوازکردنی جیاواز هەیە و نابێت بریار لەسەر هیچ کام لەو جۆرانەی باسکران بدەین بەوەی بڵێین کە بانگەواز لەگەڵیدا سودی نییە ، بەڵام دەکرێت من شیاو نەبم بۆ بانگەوازکردنی بەڵام کەسێکی تر شیاو بێت ، بۆیە وا چاکترە کە هەندێک پێوەر و تایبەتمەندی دابنێین کە دەبێتە هۆی بەردەستخستنی نەوەیەکی سەرکەوتووی باوەڕدار کە کاریگەری دروست بکەن و بەرهەمدار بن ، ئەو پۆلە پیرۆزەش هەڵدەستن بە لەئەستۆ گرتنی قورسایی خەڵک ، و فاکتەرەکانی دامرکانەوە ، هەروەها چاککردنی نەوەیەک کە گڕی ڕابردوو وای لێیان کردبێت کە بۆ نەوەی دوای خۆیان نەوەیەکی بێ بەرهەم و بێ چالاکی بەجێ بهێڵن ، کەسانێک بەجێ بهێڵن کە دڵیان پەیوەست و بەند بێت بە دونیاوە و خۆپەرست و لوتبەرز ببن ، ئەوکاتە پێویستە لەسەرت کە سەرەتا هەوڵ لەگەڵ ئەو کەسە بدەیت کە خاوەنی ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیە ، پاشان ئەوەی ئاکاری بنەڕەتی هەیە ، پاشان ئەوەی ئاکار و ڕەوشتی نەفامی هەیە ، ئەوەش ئەگەر هاتوو کات و تێکۆشانی پێویست بەردەست بوون ، ئەمەش بەکەڵک و بەسوودە لە حاڵەتی ڕێنوێنی کردن لەو کۆمەڵگایەی ئێستا تێیدا دەژین و دەیناسین و بەرکەوتەمان لەگەڵ تاکەکانی دەبێت ، بەڵام لە حاڵەتی ڕێنوێنی کردنی کەسانێک کە نایانناسیت ئەوا پێویستە پشت ببەستیت بە زیرەکی و لێهاتوویت لە ڕێنوێنیدا.

10. باسی ڕەوشت و ئاکارە جوانەکانی بەرامبەر بکات :

پێویستە کەسی ڕێنوێنیکار بە هاوسەنگی و ڕاستگۆیی بەبێ پێچ و پەنا و زیادەڕۆیی ڕەفتار بکات ، چونکە خەڵک قسەکانتیان لەیاد دەمێنێتەوە تەنانەت ئەگەر تۆ خۆت لەبیرت بچێتەوە ، گوێ بگرە بۆ ئەم ڕووداوە : لە فەرمایشتی کەعبی کوڕی مالک (ڕەزای خودای لەسەربێت) هاتووە کە فەرموویەتی : (دەرچووین کە پرسیار لە پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) بکەین و نەماندەناسی ، و پێشتر نەماندیبوو ، پیاوێکی خەڵکی مەککەمان بینی و پرسیاری پێغەمبەرمان (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) لێکرد ، وتی : "ئایا دەیناسن ؟" ، وتمان نەخێر ، وتی : " ئایا عەباسی کوڕی عەبدولموتەڵیبی مامی دەناسن ؟" وتمان بەڵێ (بە حوکمی ئەوەی وەک بازرگان دەهات بۆ لامان) ، وتی : "ئەگەر چونە مزگەوت ئەو کەسە پێغەمبەرە کە لەگەڵ عەباس دانیشتووە" ، ئێمەش چوینە ناو مزگەوت بینیمان کە عەباس دانیشتووە و پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) لەگەڵیدا دانیشتووە ، سڵاومان لێیان کرد و دانیشتین ، پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و

بنەماڵەکەی) بە عەباســـی فەرموو : (ئایا ئەم دوو پیاوە دەناســـیت؟) ، فەرمووی بەڵێ ، ئەمەیان براء کوڕی معرورە کە گەورەی هۆزەکەیەتی ، ئەوەشـــیانی کەعبی کوڕی مالکە ، حەزرەت فەرمووی : (شـــاعیرەکە؟) ، عەباس فەرمووی بەڵێ ) ، دەبینین لێرەدا پێغەمبەر (ســەڵەوات لەســەر خۆی و بنەماڵەکەی) ڕەفتارێکی بێوێنە و جوان دەنوێنێت کاتێک عەباس لەیادی دەچێت ستایشـێکی کەعبی کوڕی مالک بکات لەکاتێکدا بە براء کوڕی معرور دەڵێت (گەورەی هۆزەکەی) ، بەمەش پێغەمبەر (ســەڵەوات لەســەر خۆی و بنەماڵەکەی) ڕاســتەوخۆ دەربارەی کەعبی کوڕی مالک دەفەرموێت : "شـاعیرەکە ؟" ، بۆیە پێویسـتە لەسـەر ڕێنوێنیکار کە سـتایشـی ئاکارە جوانەکانی بەرامبەر بکات و بۆنمونە بڵێت : (تۆ لە ئاکار و ڕەوشـــتدا کەســێکی بێوێنەیت ، و تۆ لە بنەماڵەیەکی ئاینپەروەریت) پێش ئەوەی بانگەوازی بکات بۆ وەرگرتنی بەیعەت وتەریقەت.

**11. ڕووخۆشی :**

پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) زۆر جەختی لەسەر ڕووخۆشی کردووە و لە فەرمایشتەکانیدا زۆر ئـامـاژەی پێداوە و تەنـانـەت بە چاکەی دانـاوە و فەرموویەتی : "خەنـدە و بزەکردن بەرامبەر بە براکەت چاکەیەکە بۆت" ، بەڵکو تەنانەت بە بەشـــێک لە باوەڕدارێتی داناوە ، کە فەرموویەتی : "ڕووخۆشـــی لە بڕواداریە" ، لەوانەیە هەندێک کەس بڵێن پێمان ناکرێت بە حوکمی ئەوەی ئێمە کەســـانێکی جدیین و گاڵتەو گەپ نازانین !! ، بەڵام ئەم تێگەیشتنە کورت مەودایە ، ئێمە پێویستە چاو لە پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) بکەین کە دەفەرموێت : (ئێوە ئەگەر نەتانتوانی هاوکاری خەڵک بکەن بە پارەکانتان ، ئەوا هاوکاریان بن بە ڕووخۆشـی و ڕەفتاری جوان) ، پێغەمبەر (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) وەسـیەتی کرد بۆ حەزرەتی ئەبو ذر الغفاری (ڕەزای خوای لەسەربێت) و فەرمووی : (ئەی ئەبو ذر هیچ کارێکی چاکە بە کەم دامەنێ ، تەنانەت ئەوەی کە بەرامبەر بە براکەت ڕوویەکی گەشت هەبێت).

**12. بەخشینی هیوا بە خەڵک :**

هەندێک کەس زیادەڕۆیی دەکەن لە ڕەشـــبینی و گەورەکردنی لایەنە نەرێنیەکان ، بەڵام بیر لە چاکەکاری و لایەنە ئەرێنیەکان ناکەنەوە ، کێشـــەکەش گەورەتر دەبێت کاتێک هەســـت و قەناعەتە خراپەکەیان بۆ کەســـانی بەرامبەر دەگوازنەوە و دەردەبڕن ، بەمەش دەبنە هۆی بڵاوکردنەوەی ڕەشـــبینی بە خەڵک ، دەبنە کەســـانێکی ڕوخێنەر و بێهیواکەر بۆ کەسانی دەوروبەریان .

پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (گەشبین بن و ڕەشبین مەبن ، ئاسانکاری بکەن نەوەک ئاستەنگی دروست بکەن) ، ڕێنوێنیکار لەم بابەتەدا زۆرجار لە ناخی خەڵکی بەرامبەر بێهیوایی و جڵەوگیری دەبینێت ، مرۆڤیش بە حاڵی خۆی وەهایە کە حەز ناکات کەسانێک ببینێت کە ڕەشبینی بکەن ، بەڵکو حەز دەکات کەسانێک بدوێنێت کە هیوای پێ ببەخشن و ئاستەنگی واقعی لەبەردەم لا بدەن بە چەسپاندنی دڵنیایی و متمانە لە دەروونیاندا.

بڕوانە پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) وەک ئیبن هیشام لە کتێبی (السيرة النبوية) دەیگێڕێتەوە کە مژدە بە عودەی کوڕی حاتەم دەدات کەوا داهاتوو بۆ ئەم ئاینەیە ، پێی دەفەرموێت : (لەوانەیە ئەی عودەی یەکێک لەو شتانەی لە هاتنە ناو ئەم ئاینە ساردت بکاتەوە ئەو دۆخ و پێداویستیانە بێت کە خەڵک هەیانە و بۆیان دابین ناکرێت ، بەڵام سوێند بەخودا خەریکە پارە بڕژێت بەشێوەیەک کە تەنانەت وای لێبێت کەسێک نەبێت پێویستی پێی بێت بیبات ، یاخود لەوانەیە ئەوەی ساردت دەکاتەوە لە هاتنە ناو ئەم ئاینە کەمی ژمارەی باوەڕداران و زۆری ژمارەی دوژمنان بێت ، سوێند بەخودا خەریکە وای لێدێت کە ئافرەتێک لە قادسیەوە بەسەر وشترەکەی دەربچێت بەرەو کەعبە بەبێ ئەوەی هیچ ترسێکی هەبێت ، یاخود لەوانەیە ئەوەی کە ساردت دەکاتەوە بریتی بێت لە سوڵتان و پادشاکان ، بەڵام سوێند بەخودا خەریکە لە خاکی بابلەوە لە ناو کۆشکەکانیانەوە گوێت لێبێت کە کراوەتەوە بەسەریاندا) ، عودەی وتی : "منیش بەمە موسوڵمان بووم" ، هەروەها پێویستە لەسەرمان بزانین کەوا لەکاتی ڕوودانی ناخۆشی و نەهامەتی خەڵک پەنا بۆ ئاین و خودا دەهێنن ، بۆیە پێویستە هیوایان پێ ببەخشین و بێهیوایان نەکەین.

**13. ڕێنوێنیکار خۆبەکەمزانە :**

خۆبەکەمزانین وەک وتراوە : سەرمایەی خواپەرستانە ، کۆتا شت کە ڕاستگۆکان لەگەڵ خودا بە هزریان بێت بریتیە لە حەزکردن لە پلە و پایە ، خۆبەکەمزانین لەم سەردەمەش وەک جیوەی سورە ، لوتبەرزی بەسەر زۆر خەڵکدا زاڵ بووە بە ناو و شێوەی جیاوازەوە ، بەڵام فیترەتی ڕاستی مرۆڤ درکی پێ دەکات ، ئەوانەشی لە ژێر دەستەی سەرۆکێکی خۆبەکەمزان بن درۆ ناکەن بەڵکو دڵیانی بۆ دەکەنەوە و دان بە کەموکوڕی خۆیان دەنێن بۆ ئەوەی ببێتە تیمارکار بۆیان ، چونکە لوتبەرزی بەسەر خەڵکدا ڕق و کینە دروست دەکات ، دواتریش قبوڵ نەکردن ، خوداش لۆمەی لوتبەرزانی کردووە لە زۆر شوێنی قورئانی پیرۆزدا و فەرمانی بە بانگخوازان و

ڕابەرانی ئەم ئاینە کردووە کە خۆبەکەمزان بن ، لەسەر زمانی حەزرەتی لوقمان کە ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات و دەفەرموێت : ( وَلَا تُصَــعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ) (واتا : ڕووت لە خەڵک وەرمەگێڕە و بە لوتبەرزی بەســـەر زەویدا مەڕۆ ، خودا ئەوانەی خۆش ناوێت کە لوتبەرز و خۆپەرســـتن) ، پێشـــەوامان حەزرەتی ئەبوبەکری صـــدیق (ڕەزای خودای لەســـەربێت) دەفەرموێت : (ئێمە پایەداریمان بە خوداپەرستی دەست کەوت ، دەوڵەمەندیش بە دڵنیابوون ، شەرەفیش بە خۆبەکەمزانین) .

ئەمەش هەندێک لە دیاردەکانی خۆبەکەمزانینی برا بۆ برا موسوڵمانەکەی :

لوتبەرزنەکردن بەهۆی پلە و پێگە و سەروەت و سامان یاخود زانست و زانیاری و هێزی جەستەیی ، گوێگرتن لە قســـەکەی بەبێ پچڕاندنی قســـەکەی ، قبوڵکردنی ڕاکەی ئەگەر هاتوو ناکۆکی ڕویدا لەســـەر بابەتێک کە بەڵگەی لەســـەر نییە ، بەتایبەت لە بابەتە دونیاییەکاندا وەک جێبەجێکردنی پێداویســـتیەکانی ئەگەر هاتوو نەیتوانی ، و خێراکردن لە پێناو ڕازیمەندکردنی ئەگەر گرفتێک ڕوویدا ، دەستپێکردن بە سەلام ، سەردانکردن و هەواڵپرسین و یارمەتیدان ئەگەر پێویستی بوو .

حەزرەتی عەلی کوڕی حەزرەتی ئیمامی حوســـەین (ســـەلامی خودا لەســـەر خۆیان و برا و باوک و باپیرانیان) فەرمووی : (ئیمامی حەسـەن دەرچوو بۆ سوڕانەوە بە دەوری کەعبە ، کەسێک هاتە بەردەمی ، وتی : "ئەی باوکی موحەمەد وەرە لەگەڵم با بچین پێداویستی فڵان دابین بکەین" ، ئیمامی حەسەنیش وازی لە سوڕانەوە بە دەوری کەعبە هێنا و لەگەڵ پیاوەکە ڕۆیشت ، کەسێکی تر لەولاوە کە ئیرەیی بەو پیاوە برد کە ئیمامی حەسەن لەگەڵی ڕۆیشـــت ، بە ئیمامی حەســـەنی وت : "ئەی باوکی موحەمەد ئایا واز لە ســـوڕانەوە لە دەوری کەعبە دەهێنیت و لەگەڵ ئەو دەڕۆیت ؟ " ، ئیمـامی حەســـەن فەرمووی : "ئەی چۆن لەگەڵی نەچم کە پێغەمبەر (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) فەرمووبێتی : (هەرکەس بچێت بەدەم پێداویســـتی براکەی و جێبەجێی بکـات بۆی حەج و عەمرەیەکی بۆ دەنوســـرێـت ، ئەگەریش نەیتوانی بۆی جێبەجێ بکـات مـادەم بەدەم پێداویستیەکەیەوە چووە عەمرەیەکی بۆ دەنوسرێت) ، بۆیە منیش حەج و عەمرەیەکم بۆ نوسرا و گەڕامەوە بۆ سوڕانەوە بە دەوری کەعبەدا")

14. ڕێنوێنیکار خاوەن شان و شکۆیەکی هاوسەنگە :

سەرەڕای گرنگی و پێویستی گاڵتە و گەپ ، و پێداویستی خەڵک بۆ دڵخۆشکردنیان ، و ڕێز و پێزانیان بۆ ئەو کەسانەی خۆش گوفتارن ، بەڵام پێویستە لەمەشدا هاوسەنگی و نێوەندگیری بکرێت ، نابێت نە کەمتەرخەمی تێدا بکرێت و نەش زیادەڕۆیی ، چونکە زۆری گاڵتەجاری و بەردەوامبوون لەسەری دڵ توند دەکات ، شان و شکۆ ناهێڵێت ، بەهای مرۆڤ کەم دەکاتەوە ، دەیکاتە مایەی گاڵتەجاری و بەکەم دانان لەلایەن خەڵکەوە ، هەروەها دەیخاتە هەڵە و کەموکوڕی زۆری لێ دەردەکەوێت ، بۆیە پێویستە زیادەڕۆیی لە گاڵتەجاری نەکرێت و زیادەڕۆیی لە پێکەنین و خۆشی نەکرێت.

وتراوە : هەموو شتێک تۆوی هەیە و تۆوی دوژمنداریش گاڵتەجاریە ، هەروەها وتراوە : گاڵتەجاری لەناوبەری هاوڕێیە ، وتراویشە : گاڵتەجاری سەرەتاکەی بۆ خۆشیە و کۆتاییەکەی جدێتیە ، هەبوونی شان و شکۆ لەگەڵ ئیخلاس بوون و خۆبەکەمزانین و خەندەکردن و ڕووگەشی و قسەخۆشی ، ئەمانە پێویستە بڵێین ئەو سیفەت و تایبەتمەندیانە کە سەرنجی بەرامبەر ڕادەکێشن و ڕوحەکان پێی ئارام دەبنەوە.

15. ڕێنوێنیکار بەخشندەیە :

پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (کەسی بەخشندە لە خودا نزیکە و لە خەڵک نزیکە و لە بەهەشت نزیکە و لە دۆزەخ دوورە ، ڕەزیلیش دوورە لە خودا و دوورە لە خەڵک و دوورە لە بەهەشت و نزیکە لە دۆزەخ ، نەزانێکی بەخشندە لای خودا خۆشەویستترە لە زانایەکی ڕەزیل) ، و یەحیای کوڕی معاذ (ڕەزای خودای لەسەربێت) دەفەرموێت : (لە ناو دڵدا بۆ کەسانی بەخشندە تەنها خۆشەویستی هەیە ئەگەر تەنانەت خراپەکاریش بن ، بەڵام ڕق و کینە هەیە لەناو دڵدا بۆ کەسانی ڕەزیل ئەگەرچی چاکەکاریش بن) ، بۆیە بەخشندە ببە ئەگەر بە لێبوردن و لێخۆشبونیش بێت.

16. ڕێنوێنکار خاوەنی زانستە :

ڕێنوێنکاری نەزان و نەخوێندەوار سەرکەوتوو نابێت لە بانگەواز بۆ ئاین ، پێویستە ئەوەندەی لە توانادایە خۆی فێری زانستە شەرعیەکان بکات بۆ ئەوەی بتوانێت بیگەیەنێت بە خەڵک ، وەک پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (خۆت شەرعزان بکە ئەوکات خۆت تەرخان بکە بۆ پەرستش)

پاشان پێویستە لەسەر ڕێنوێنکار کە چاوکراوە بێت بە حوکمە شەرعیەکان بە ڕێپێدراو (حەڵاڵ) و ڕێپێنەدراو (حەرام) ، چاوکراوە بێت بەو کەسانەی کە بانگەشەیان دەکات لە ڕێگەی زانینی حاڵ و دۆخیان ، هەروەها

پێویسـتە زانیاری هەبێت لەسـەر ئەو شـێواز و ڕێگە و ڕێوشـوێنەی کە لەڕێیەوە بانگەشـەیان دەکات ، گرنگترینیش ئەوەیە کە زانیاریەکی دروسـت و زۆری هەبێت لەسـەر قورئانی پیرۆز و سـونەتی پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ، چونکە هەموو زانستێک بەیەکێک لەو دوانە دەگاتەوە ، بۆیە پێویستە ئەو دووانەی ڕووبەڕوو بکرێتەوە ، دوای ڕووبەڕوو کردنەوە یان ئەوەتا لەگەڵ قورئان و سـونەت دەگونجێت یاخود نا ، ئەگەر گونجا قبوڵ دەکرێت ، و ئەگەریش نەگونجا ڕەت دەکرێتەوە جا هەرکەسێک وتبێتی ، باسکراوە لە ئیبن عەباس (ڕەزای خودا لەسەر هەردووکیان) کە فەرموویەتی : (خەریکە کە لە ئاسمانەوە بەردتان بەسەر دابارێت ، من دەڵێم پێغەمبەر وای فەرمووە و ئێوە دەڵێن ئەبوبەکر و عومەر وای فەرمووە) ، خۆ ئەگەر ئەمە لە قسـەی حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر بێت کە ئەگەر پێچەوانەی قسـەی پێغەمبەر (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) بێت ڕەت دەکرێتەوە ، چ جای کەسانی تر ؟

بەم شێوەیەش یەکەم شت کە پێویستە بانگەوازکار هەیبێت زانستێکی وەرگیراوە لە قورئانی پیرۆز و سونەتە دروست و قبوڵکراوەکانی پێغەمبەر (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) ، بەڵام بانگەوازی بەبێ زانست بریتیە لە بانگەوازی بە نەزانی ، بانگەوازکردنیش بە نەزانی زیانەکەی لە سـودەکەی زیاترە ، چونکە ئەم بانگەوازکارە خۆی وەک ڕێنوێنیکار و ئاراسـتەکار ناسـاندووە ، ئەگەر هاتوو نەزان بوو ئەوا بەمە دەبێتە کەسـێکی گومڕا و گومڕاکەر پەنا بە خودا ، ئەم جۆرە نەزانینەش لە نەزانینێکی ئاسـایی خراپترە ، نەزانی ئاسـایی دەبێتە هۆی ئەوەی کە خاوەنەکەی قسـە نەکات و بێدەنگ بێت ، بەڵام نەزانی لەم جۆرە کێشـەکەی گەورەترە چونکە ئەم جۆرە نەزانە بێدەنگ نابێت بەڵکو قسە دەکات و بەمەش تێکدەر و ڕوخێنەر دەبێت نەوەک نوربەخش

ئەی ڕێنوێنیکار بڕوانە فەرمایشتی خودای مەزن : ( قُلْ هَٰذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي ۖ وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ) (واتا : بڵێ ئەمە ڕێگای منە بانگەواز بۆ خودا دەکەم من و ئەوانەی شوێنم کەوتوون لەسـەر چاوکراوەیی و گەورەیی بۆ خودا و من لەوانە نیم هاوەڵ بۆ خودا دابنێم)، واتا لەسـەر چاوکراوەیی لە سێ بابەتدا : بابەتی یەکەم : لەسەر چاوکراوەیی لەو شتەی بانگەوازی بۆ دەکرێت ، بەوەی کە زانا بێت بە حوکمە شـەرعیەکانی کە بانگەوازی بۆ دەکات ، چونکە لەوانەیە بانگەواز بۆ شـتێک بکات کە بە پێویست (واجب)ی ببینێت ، بەڵام لە شـەرعدا پێویست نەبێت ، بەمەش بەندەکانی خودا بە شتێک ناچار بکات

کە خودا ناچاری نەکردوون ، لەوانەشـــە بانگەوازیان بکات بۆ وازهێنان لە شـــتێک کە بەلایەوە ناپەســـەندە (حەرامە) ، لەکاتێکدا لە ئاینی خودادا ڕێپێدراو بێت ، بەمەش بەندەکانی خودا بە وازهێنانی لە شـــتێک ناچار دەکات کە خودا ناچاری نەکردوون وازی لێ بهێنن .

بابەتی دووەم : چاوکراوەیی لەکاتی بانگەوازکردن ، هەر بۆیە کە پێغەمبەر (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) کە معاذی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو : (تۆ دەچیت بۆ لای کەسانێک کە کتێبی ئاسمانیان پێشتر بۆ دابەزیوە) ، ئەمەش بۆئەوەی خۆی بۆ ئەوان ئامادە بکات و حاڵ و دۆخیان بزانێت ، بۆیە پێویســـتە ئاســـتی زانستی ئەو کەسە بزانیت کە بانگەشەی دەکەیت ؟ هەروەها ئاستی دەمەقاڵێی ؟ بۆ ئەوەی خۆت ئامادە بکەیت بۆ گفتوگۆ و قســـەکردن لەگەڵی ، چونکە ئەگەر کەوتیتە گفتوگۆ لەگەڵی و توانیت بە قســـە بیبەزێنیت یاخود توانای ئەوەت هەبوو گفتوگۆی لەگەڵ بکەیت ئەوا ئەمە ســـەرکەوتنی حەق و ڕاســـتیە و تۆ هۆکارەکەی ، وانەزانیت کە خاوەنی هزرە چەوتەکە دەست هەڵدەگرێت لە بیروبۆچونەکەی بە ئاسانی ، پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (ئێوە کێشمەکێشم وکێبرکێ دەکەن و دەیهێننەوە لای من ، و لەوانەیە هەندێکتان بەڵگەکەی خۆی لا پەســـەند تر بێت لەوەی تر ، بەڵام من بڕیاری لەســـەر دەدەم بەو جۆرەی کە دەیبیســـتم لێتانەوە) ، ئەمەش نیشـــانەی ئەوەیە کە کەســـی بەرامبەر ئەگەر لەســـەر هەڵەش بێت پێی وایە ڕا و بۆچونەکەی پەســـەندتر و دروســـتترە ، لەبەر ئەمەشـــە ئەگەر تۆ زانیاریت هەبێت دەتوانیت بۆچونە ڕاســـت و پەسەندەکە یەکلا بکەیتەوە .

بابەتی ســـێهەم : چاوکراوەیی لە چۆنیەتی بانگەوازکردن ، خودای گەورە دەفەرموێت : (ادْعُ إِلَىٰ سَـــبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَـــنَةِ ۖ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَـــنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَـــلَّ عَن سَـــبِيلِهِ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ) (واتا : بانگەواز بۆ ڕێگای خودا بکە بە حیکمەت و وتەی چاک و بەو شـــێوەیە لەگەڵیان بدوێ کە باشـترە ، خودا دەزانێت کێ گومڕا بووە و کێ ڕێگای ڕاســتی دۆزیوەتەوە) ، لەوانەیە کەسـێک بڵێت : ئایا ئەم قسەیەی تۆ دژ بە فەرمایشتی پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ناوەستێت کە دەفەرموێت : (لە منەوە ئەگەر یەک فەرموودەش بوو بیگەیەنن)؟ ، لە وەڵامدا دەڵێین : نەخێر ، چونکە پێغەمبەر (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (لە منی بیگەیەنن) ، بۆیە پێویســـتە ئەوەی کە دەیگەیەنین لە پێغەمبەر (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) هاتبێت و فەرمووبێتی ، ئەوەیە کە ئێمە دەمانەوێت ، ئێمە

**ناڵێین کە بانگەوازکار پێویستیەهەتا ئاستێکی زۆر و دووری زانست ڕۆیشتبێت بەڵکو دەڵێین پێویستە تەنها ئەوە بڵێ کە دەیزانێت ، لە شتانێک قسە نەکات کە نایزانێت.**

**کۆمەڵە هەڵەیەک کە پێویستە کەسی ڕێنوێنکار ئاگادار و وریایان بێت :**

1. **دەمدەمە و دەمەقاڵە :**

**نەفسی مرۆڤەکان وەها حەزی بۆ دەمەقاڵە چووە ، کە نەفس نەتوانێت حەق و ڕاستیەک قبوڵ بکات کە لە کەسی بەرامبەرەوە دەرچووبێت لەکاتێکدا ئەم بیەوێت دەمکوتی بکات و بیبەزێنێت و کەموکوڕیەکانی قسەی بەرامبەر دەربخات ، توشی کەسانێک بووین کە شارەزان لە دەمەقاڵەدا بەشێوەیەک کە ناوەستنەوە هەتا دەکەونە هەڵە و بەمەش خەڵک خۆیانیان لێ بەدوور دەگرن و حەز بە دیداریان ناکەن ، تەنانەت ئەگەر حەقیش لەگەڵ تۆدا بوو ، دەمەقاڵە بسڕەوە لە فەرهەنگی ژیانت ، تەنانەت ئەگەر ئەوانەی پەروەردەیان کردوویت ئەنجامیشیان دابوو ، چونکە پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) پێشەوا و ڕابەری ئێمەیە ، هەرکەسیش غەیری ئەو بێت ئەکرێ قسەکەی وەربگیرێت و ئەکرێ ڕەت بکرێتەوە ، تۆ ئەگەر ویستت مرۆڤێک لەدەست بدەیت !! ئەوا دەست بکە بە دەمەقاڵە لەگەڵی ، دڵتەنگ و خەفەتبار مەبە بەو دەمەقاڵێ و گفتوگۆ و دەمارگیریانەی دەیبینیت لە کەناڵە ئاسمانیەکان کە بەشێوەیەک دەمارگیرن بۆ ڕای خۆیان کە ئەگەر تەنانەت هەڵەش بن دانی پێدا نانێن بۆ ئەویە نەوترێت دەمکوت کرا ، ئەمەش لە دەرئەنجامدا تەنها دەبێتە هۆی لێکترازانی خەڵک و دامرکانی دڵەکان.**

2. **وەسوەسەی نەفس :**

**لەوانەیە هەندێک وەسوەسە بێت بەسەر نەفستدا لەوانەش :**

**پێت دەڵێت تۆ خاوەنی کەسایەتیەکی لاوازیت و قسەکانت کاریگەریان نییە بۆیە خۆت مەخە ناو ئەم کارە بۆ ئەنجامدانی کاری ڕێنوێنی بۆ ئەوەی شکست نەهێنیت و دەرئەنجامەکان ئابڕووت نەبەن ، بێگومان بابەتەکە بەم شێوەیە دەبێت ئەگەر هاتوو پێت وابوو بانگەوازکردن پیشەیەکە ، بەڵام ئەگەر وەها لێی تێگەیشتیت کە بریتیە لە پەرستش و نزیکبوونەوە لە خودا و پاداشتەکەی لەلایەن خوداوە گەرەنتی کراوە ان شاء الله ، ئەگەر هاتوو تۆ بە دروستی گەیاندت و موخلیس بویت ، ئەوا پاداشت وەردەگریت بە تەنها بانگەوازکردن ئەگەر**

تەنانەت بەدەم بانگەوازەکەشـــت نەیەن ، ئەگەر بانگەوازکاری وەک کار و پیشـــە دونیاییەکان بێت کە بڕیار لەســـەر ســـەرکەوتنی بدەین بەو دەرئەنجامانەی بە ڕووکەش دەردەکەون ، ئەوا واتا پێویســـتە بڕیار لەســـەر زۆرێک لە پێغەمبەران (ســـەلامی خودایان لەســـەربێت) بدەین بەوەی ســـەرکەوتوو نەبوونە ، ئەوەتا بۆنمونە حەزرەتی نوح (ســـەلامی خوای لەســـەربێت) لەناو هۆزەکەی مایەوە بۆ ماوەی ٩٥٠ ســـاڵ بانگەوازیانی کرد هەتاکوو تۆفانەکە نوقمیانی کرد ، کەسانێکی کەم باوەڕیان هێنا ، پێغەمبەرانی تریش بەهەمان شێوە ، لە ڕۆژی قیامەتدا کە حەشـــر دەکرێن ، تێیاندا هەیە یەکێک یان دووان یان ســـێ کەســـی لەگەڵە و هەندێکیان هیچ باوەڕدارێکی لەگەڵ نابێت .

ئەگەر خودا سەرکەوتنی بانگەوازی بەستبێتەوە بە ڕووتێکردنی خەڵک ئەوا ئەمە دەبوو بە سزا بۆمان ، بەڵام خودای گەورە بە ڕەحمی خۆی وای کردووە کە پاداشـــتەکە بەســـترابێتەوە بە هەوڵ و ماندووبوونەکان نەوەک ئەنجامەکان ، پاشان ئەو دەتپارێزێت و کارەکەت ئاسان دەکات چەندە خۆت ماندوو بکەیت لەگەڵ ئەو بانگەوازە ، پشـــت و پەنات دەبێت و جێگیر و ســـەربەرزت دەکات ، لەگەڵ ئەوەشـــدا جەخت دەکاتەوە لەســـەر ئەوەی کە بانگەوازەکە بگەیەنیت ، بەمەش هیمەتی شـــێخەکانی تەریقەت دەبینیت لەگەڵت کاتێک ڕێنوێنی دەکەیت ، گوێی خەڵکت بۆ دەکەنەوە ، زمانت پاراو دەکەن هەتاکو بانگەواز بۆ خودا بکەیت و موخڵیس بیت لە نیەتەکەتدا.

پێویســـتە لەســـەر تاک کە هەوڵ بۆ چاکە بدات و گوێ بە دەرئەنجامەکان نەدات ، ئەگەر خەڵک ئەمڕۆ کاریگەر نەبوون بە قسەکەت ئەوە دەکرێت سبەی کاریگەر بین ، وەک پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (کەسی چاک لە ڕۆژی قیامەت وەفادارێکی ئومەتەکەمە)

ئەگەر خودای گەورە پاداشـــتەکەی بە دەرئەنجام ببەســـتایەتەوە ئەوا خەڵک خامۆش بوون و مت بونیان لەتۆ دەبینی لەبەر هێواشی وەڵامدانەوەیان بۆ بانگەوازەکە ، و نەفست فەرمانی پێ دەرکردیت کە وەک ئەوان بیت و تۆ شوێن ئەوان بکەویت ئەگەر ئەوان بە هێواشـی و بەکەمی ڕووت تێبکەن ، ئەوکات کەسی ئیماندار ڕەفتاری دەگۆڕا لەگەڵ موســـوڵمانەکاندا ، لەکاتێکدا ئێمە دەزانین کە موســـوڵمانەکان هەموویان بران ، موســـوڵمان کە کەسێک ببینێت تاوان دەکات ئەو تەنها ئەوە دەزانێت کە دەرگا هەمیشە کراوەیە و دەکرێت ئەو تاوانکارە تەوبە بکات و بگەڕێتەوە ، ئەوەشـــی پشـــت لە موســـوڵمانان بکات دوای ئەوەی دەیانناســـێت ، دەکرێت بگەڕێتەوە ، ئەوەشـــی ڕوو لە موســـوڵمانان دەکات دەکرێت پلە و پایەی بەرز ببێتەوە ، لەوانەیە لە نەفســـی خۆتدا بڵێیت :

جارێک تۆ زانستت کەمە ، بانگەوازیشی پێویستی بە شەرعزانێکی زانا هەیە کە پرسیارەکانی خەڵک وەڵام بداتەوە و گومانیان بڕەوێنێتەوە و بەرامبەر ببەزێنێت و کۆتایی بە دەمەقاڵێ بهێنێت . لە پێغەمبەرەکەتەوە (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ئەگەر یەک فەرموودەش بوو بیگەیەنە ، کەس نکۆڵی لەوە ناکات کە چەندە زانست گرنگ و پێویستە ، بەڵام کێ لە ئێمە گەیشتووەتە ئەوجی زانست و تەواوی کردووە ؟ ئایا سنورێک بۆ زانست هەیە کە کەسەکە پێی گەیشت ئەوکات بزانێت کە زانستی تەواوەتی لایە بۆ ئەوەی بانگەواز بکات ؟ و ئایا خەڵک پێویستیان بەو هەموو قوڵبوونەوە لە زانست هەیە بۆ ئەوەی ڕێنوێنیان بکەین بۆ ئەو چاکەکاری و چاکبوونەی کە خودا لەسەری دروستی کردوون ؟ ... ئێمە ڕێنوێنکارین ، ئەگەر موخلیس بین ئەوا دەزانین کە ئەو زانستەی هەمانە بۆ بانگەواز بۆ ڕێگای خودایە نەوەک بۆ بەزاندنی خەڵک و دەمکوتکردنیان یاخود ڕووتێکردنمان لەلایەن خەڵکەوە کاتێک بەرامبەر ببەزێنین ، قوڵبوونەوە لە زانستە فەرعیەکان فەرزێکی کیفایەتە کە هەندێک کافیە ئەنجامی بدەن ، مرۆڤ داوای زانست دەکات لە منداڵیەوە هەتاکوو مردن ، وەک سەعیدی کوڕی جبیر (ڕەزای خودای لەسەربێت) فەرمووی : (کەسێک زانا دەمێنێت هەتاکو بەردەوام بێت لە فێربوون ، هەرکات ڕاوەستا و پێی وابوو ئیتر کاری پێ نەماوە و ئەوەی دەیزانێت بەسیەتی ، ئەوا ئەو کەسە نەفام و نەزانە) ، پاشان تۆ تایبەتمەندیەکی گەورەت هەیە کەوا لای زۆرێک لەو کەسانە نییە کە مێشکیان پڕە لە زانست و دەمەقاڵە و گفتوگۆ ، ئەویش ئەو ویستەیە کە پاڵی پێوە ناویت بۆ گەڕان بەدوای ڕێگایەک کە لەڕێگایەوە خزمەتی ئیسلام بکەیت ، و کەسێک کە بیرۆکە کەمەکانی بە ویست و گرجوگۆڵی جێبەجێ دەکات چاکتر و باشترە لەوەی مێشکی پڕە لە بیرۆکە بەڵام دەستەکانی ناتوانن ئەنجامی بدەن ، لەوانەیە شەیتان بێتە لای یەکێکمان و بڵێت : ئەم کەسەی بەرامبەر لە زانست و ڕۆشنبیری و وریایی گەورەتر و زیاترە ، چۆن کاریگەر دەبێت بە قسەکانت لەکاتێکدا تۆ نەگەیشتویت بەو ئاستە !!

3. خۆنمایشکردن (ڕیا) و چاوچنۆکی لە دونیادا :

ئەگەر ڕێنوێنکار مەبەستی بێت ڕوو بکاتە کەسێک کە ئاینی خودای قبوڵ نەبێت و بە گەورەی دابنێت لەپێناو پارە یاخود پلە و پێگەیەک کە بیخاتە سەروو ڕێنوێنیکراوان ئەمە تێڕوانینێکی هەڵەیە ، ئیبن سەماک دەڵێت : بۆچی کاتێک بێم بۆ کوفە زانایی و ژیریم زیاد دەکات و دەستم دەکەوێت ؟ خزمەتکارەکەی وتی : چاوچنۆکی زمانتی تیژ کردووە.

یاخود لەوانەیە قســەی بەرز و نزم یاخود ڕەفتاری زیاد و کەم بەشــێوەیەک بکەیت کە ســەرنجی بەرامبەرت ڕابکێشــیت یاخود پلە و پێگەت لە دڵی ئەودا بەرز بکات و وابزانیت و گومانت وابێت بەمە دەتوانیت نزیکی بکەیتەوە لە بانگەوازەکە ، ئەم گومانەت پوچە و خودپەرستیت زیاد دەکات ، باسکردنی کار و چالاکیەکانت بۆ بەرامبەر زیاد لە پێویســت ، یاخود گیانفیداییکاریەکانت بەبێ گوێپێدان بە بەرامبەر ئەمە وەک دەرمان وایە کە زیاد بکات زیانی هەیە و ســودی نییە ، بریتیە لە کەموکوڕی ، ئەگەر هاتوو قوڵی پەیوەندیت لەگەڵ کەســێکی گەورەدا بۆ نیشــاندانی لوتبەرزیەکەت بێت یاخود بۆ نیشــاندانی بەکەمدانانی ئەو و سـڵ کردنەوە لە قســەکردن لەگەڵی بۆ ئەوەی نیشانی بدەیت کە پلەی تۆ لەو بەرزترە ، یاخود لەگەڵ کەسێکی تردا لەبەرامبەر ئەو بە ئاماژە قســە بکەیت تاکو ئەو بخەیتە وەهمەوە ، یاخود وا ئەو تێبگەیەنیت کە تۆ نهێنیەکان دەزانیت و ورد دەبیتەوە لە جوڵەکان ئەمە هەمووی خۆنمایشکردنە (ڕیایی).

چۆن ڕێنوێنیکار بانگەوازی ئەو کەسانە بکات کە لەخۆی زانا ترن ؟

خودای گەورە دەفەرموێت : (وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ ) (واتـا : گوێڕایەڵی خودا ببن و خودا فێرتـان دەکـات)، و پێغەمبەر (سەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرموێت : (هەرکەس بە موخڵیسی و ڕاستگۆیی بۆ خودا چل ڕۆژ بەڕێ بکات دەماری حیکمەت و زانایی لە دڵی دەتەقێ و لە زمانیدا دێتە دەر) ، پرسیارەکە لێرە ئەوەیە : کار چیە ئەگەر هاتوو هەندێ کات ئەو کەســانەی ڕێنوێنی دەکرێن ئاســتی زانســتیان زۆرتر و زیاتر بێت لە خودی ڕێنوێنیکار؟ بۆنمونە کەســێک خاوەنی بڕوانامەی ناوەندییە و ڕێنوێنی کەســێک دەکات کە هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە و زانستێکی زۆری هەیە ، ئەمە بە نەرێنی کاریگەری لەســەر دەروونی کەسی ڕێنوێنکار دروست دەکات ، ئایا ئەو ڕێگا زانستیانە چین کە پێویستە پەیڕەو بکرێن بۆ دەربازبوون لەو بەربەستانەی دێنە ڕێگای بۆ ڕزگاربوون لەوە ؟

دەڵێین : پێویستە لەسەر ڕێنوێنکار کە نەفس و حەز و ئارەزووەکانی خۆی ببەزێنێت بە پەرستش و خۆگرتنەوە لێیان و زۆری خوێندنی ویرد و تەســبیحات ، پاشــان واز لە خوێندنەوە و فێربوونی زانســتە ئاینیە بنەڕەتیەکان نەهێنێت ، بەمەش ســەرکەوتوو دەبێت لە لایەنی ئاینەوە ، لە ڕێنوێنی کردن پێش دەکەوێت ، ئەوکـات پێی وانابێت کە کەمترە لەوانەی قسـەیان بۆ دەکات چونکە ئەو شـتانێکی خوێندووە کە ئەوان نەیانخوێندووە ، بۆیە

ئەوان پێویستیان بەوەیە کە لە ئاینەکەیان و زانستەکەی فێرببن جا هەر پلە و پایەیەکی زانستیان هەبێت لە ژیاندا وەک : پزیشکی ، ئەندازیاری ، گەردووناسی.

هەندێک خەڵک سەرەڕای شارەزابوونیان لە پسپۆڕیەکەیان بەڵام نەخوێندەوارن لە بابەتە ئاینیەکاندا ، ئەو کەسەی کە زانستەکانی قورئان و زانستەکانی سونەتی پەیامهێنەری خودا و زانستی تەسەوف (ئەوەی کە جێبەجێکردنی لایەنی کردارەکیە بۆ خاوێنکردنەوەی دڵ و دەروون) ، ئەوا ئەو کەسە باشترینی زانستەکان فێربووە و بەمەش هەست بە هیچ کەم و کوڕیەکەک ناکات چونکە کاری بەوە کردووە کە خودا لە زانست پێی بەخشیوە و ئەوەی فێرکردووە کە نەیدەزانی ، وەک لە کتێبی الصحاح هاتووە ، وەک وتراوە (ئەوەی قورئان بزانێت و فێری ببێت و ببینێت کە کەسێک شتێکی تری باشتر لەوەی ئەمی پێ دراوە ، ئەوا شتێکی بچوکی بە گەورە و شتێکی گەورەی بە بچوک داناوە) بۆیە دەڵێین بە ئەو کەسەی کە ڕێنوێنی دەکات : پێویستە چاک خۆت فێربکەیت ، تا کاتێک قسەت بۆ خەڵک کرد پاداشتێکی گەورە وەربگریت بەوەی ئەوەیان فێر بکەیت کە نەیاندەزانی ، مرۆڤ پێویستە فێرببێت و نەوەستێت لە خاڵێک و بەردەوام ببێت هەتا خودا ویستی لەسەرە ، نەزان ئەو کەسە نییە کە نازانێت بەڵام ئەو کەسە نەزانە کە پێی وابێت پێویستی بە فێربوونی زانستی زیاتر نییە ، و فێربوونی زانستی شەرعی بە پێویست دەزانین ، چونکە زانست بنەڕەتترین پێداویستی ڕێنوێنیکارە ، هەروەها ئەوەندەی لە توانادایە فێربوونی زانستە هەمەجۆرەکانی تر ، و زۆر کتێب خوێندنەوە و هەمەجۆرێتیەکەی پێویستە و گرنگە ، نەوەک بەستنەوەی بە یەک جۆرە ، چونکە ئەوە ڕێگات بۆ دەکاتەوە کە لە بواری فراوانترەوە بچیتە دڵی خەڵک.

ئاکاری پابەندبوون بە فەرمانەکانی شێخی تەریقەت :

لەو بابەتانەی کە گرنگە و پێویستە لەسەر هەموو مورید و پەیڕەوکارێک کە گوێڕایەڵی بێت و مورید ناتوانێت بەبێ ئەوە بگاتە مەبەستەکەی و ڕێگای سەرفرازی لە تەریقەت دا .

یەکەم : ڕێگا نادرێت بە هیچ موریدێک کە سەردانی کەسە نزیکەکانی شێخ بکات وەک : (کوڕی مام ، برا ، ...هتد) بۆ کارێک یان بۆ یارمەتیەک کە پێی وابێ ئەمە وەک خزمەتکردنی خودی شێخە ، ئەمەش ڕێگەپێدراو

نییه بەبێ ڕێگەپێدانی شـێخی تەریقەت ، هەروەها پەیوەندی کردن لەگەڵ خزم و کەسـوکاری شـێخیش بەهەمان شێوە ، چونکە پەیوەندی دەروێش تەنها لەگەڵ شێخەکەی دەبێت .

دووهەم : ڕەفتاری هەندێ لە موریدان و پەیوەندی دروستکردنیان لەگەڵ کەسە نزیکەکانی شێخ بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندی شـــێخی تەریقەت زۆر زیانی پێیان گەیاندووە و بووەتە هۆی کەوتنیان وەک چۆن گەڵای درەختێک دەکەوێت لە پایزدا .

سێهەم : پێویستە لەسەر مورید کە لە پیرۆزی و گەورەیی گوێڕایەڵیکردنی فەرمانی شێخەکەی تێبگات و تەنها گوێڕایەڵی ئەو بێت ، یاخود ئەو کەسەی شێخەکەی بە فەرمی دیاری دەکات.

چوارەم : پێویســـتە لەســـەر مورید کە لەم بابەتانە تێبگات بەوەی کە بنەڕەتی ڕەفتار و ئاکارەکانن ، ئەوەی لەم قسانە تێنەگات و کاریان پێنەکات ئەوا سەرفراز نابێت لەم ڕێگە و تەریقەتە دا.

پێنجەم : پێویستە مورید قسەی شێخی حازری تەریقەت وەربگرێت و پێی وابێت فەرمایشتی حەزرەتی سوڵتانە و فەرمایشتی حەزرەتی سـوڵتانیش گوێڕایەڵی بێت وەک فەرمایشـتێکی خودایی ، چونکە ئەم قسـەیە هێزی (کن فیکون) (واتا : ببە و دەبێت)ی هەیە ، لە بەسەرهاتی حەزرەتی یوسف و یەعقوب سەلامی خودایان لەسەربێت لە قورئانی پیرۆز وانەیەک هەیە بۆ ڕەفتاری مورید ، ئەگەر براکانی یوسف وەک پارێزەر و خزمەتکار بوونایە بۆ حەزرەتی یوسف ئەوا ئەوە ڕووی نەدەدا کە ڕووی دا ، ئەمەش چونکە خودا حەزرەتی یوسفی لەناو براکانی هەڵبژارد ، هەر بۆیە دڵی حەزرەتی یەعقوب لەلای حەزرەتی یوسف بوو نەوەک براکانی .

هەر موریدێک لەم خاڵانە تێنەگات و کارێک یاخود خزمەتێک بکات ، ئەوا پاداشـــتی بۆ نییە ، بەڵکو پێویســـتە لەسـەری کە هەڵەی بێفەرمانیکردنی شێخەکەی لەئەستۆ بگرێت ، ئەمەش یاسا و مەرجەکانی ئاکاری دروستە لە تەریقەتدا و لەو پێویستیانەیە کە گرنگە جێبەجێکردنی.

پوختە :

کۆتایی بە بابەتەکەمان دەهێنین بە پوختەیەک لەســەر ئەوەی باسـمان کرد لە بنەماکانی ڕێنوێنی لە تەریقەتدا بە چەند خاڵێک :

1. ڕێنوێنی کردن پیرۆزترین پیشـــەیە لە پیشـــەکـانی موسـوڵمـانـدا ، خودا پێغەمبەران و هەڵبژێردراوان و پەیامهێنەرانی ناردووە لەبەر ئەم پیشــەیە ، حەزرەتی شـێخ سـوڵتان خەلیفە موحەمەدی کەسـنەزانی (هیمەتی حازربێت) دەفەرموێت : (بە ڕێنوێنی کردن فەرزەکان دەچەسپێن و پێویست دەبن لەسەر کەسەکە) ئەو شتەی کە پێویستیەک بەبێ ئەو ناگاتە جێ ئەوا دەبێتە شتێکی پێویست.
2. ســەرەڕای ئەوەی کە ڕێنوێنی کردن فەرزێکی کیفایەتە (واتا بەشـێک لە خەڵک ئەنجامی بدەن کافیە) لە دۆخی ئاسـاییدا ، بەڵام لەم ســەردەمەی ئێسـتاماندا یەکێکە لەو بابەتانەی پشـتگوێ خراوە بەڵام بەڕادەیەک گرنگ و پێویســت بووە کە بووەتە فەرزێکی عەینی (واتا هەموو خەڵک ئەنجامی بدەن) ، بۆیە نابێت بەهیچ شـێوەیەک پشتگوێ بخرێت.
3. هەرکەس بمرێت و ڕێنوێنی کردنی پشـــتگوێ خســـتبێت ، ئەوا نزیکە لە دووڕوویەوە ، چونکە پیشــــەیەکی پیرۆزی واز لێهێناوە لەبەر پیشە کەسیەکانی خوی بەمەش لە پاداشت بێبەشە .
4. ئەو کۆمەڵگایەی کە ڕێنوێنی تێدا ئەنجام دەدرێت خودا دەیپارێزێت لە بەڵای زەوی و ئاســمان ، تەنانەت ئەگەر ئەو کەســـانەی ئەم کـارە پیرۆزە ئەنجـام دەدەن چەنـد کەســێکی کەمیش بن ، بە پێچەوانەی ئەمەشـــەوە دەرئەنجامەکە پێچەوانە دەبێتەوە ، واتا لەوانەیە خەڵکانێک لەناو بچن کە تێیاندا نەبێت ئەم پیشە پیرۆزە ئەنجام بدات ، و لەناوچوونی بەشێک لە خەڵکی ئێمە بەهۆی ئەمەوە دوور نییە کە ڕووبدات.
5. ئەم پیشە پیرۆزە بەشێکە لە پرۆگرامی تاک و کۆمەڵ و دەوڵەتەکان ، موسوڵمان ڕەگەزی بنەڕەتیە لە سیستەمی جیهاندا ، وەک چۆن سیستەم لە جیهانێکدا نییە کە موسوڵمانی تێدا نەبێت ، بەهەمان شێوەش تیرۆر و جەنگ و نەهامەتی نییە لە شوێنیکدا کە موسوڵمانی تێدا بێت ، ئەمەش وەستاوە لەسەر هەستانی موسوڵمان بە ئەرک و پیشەکەی و بەجێگەیاندنی.
6. ئەنجامدانی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە ، هێمای باوەڕە ، لابردنی ئەم پیشـــەیە و جوداکردنی لە باوەڕ هەرگیز نەبووە و نابێت ، لە قورئانی پیرۆزدا باوەڕدارانی داناوە بەوەی کە پشــت و پەنای یەکترن ، ئاماژە بەو بڕبڕە سـەرەکیەی کە پشتبەستنە بەیەکتر ، لەکاتێکدا دووڕووەکان پشتیان بەیەکتر قایم و بەهێز نییە ، ڕێگری لە چاکە دەکەن و فەرمان بە خراپە دەکەن.

7. خودا بەڵێنی داوە بە پاراستنی ئاینەکەی ، دەردەکەویت کەوا پاراستنی خودا بەستراوە بە گرجوگۆڵی باوەڕداران هەموویان و هەستانی بەشێکیان بە سەرخستنی ئاینەکە ، و ئاماژەیەکی ڕوون بۆ ئەم سەرکەوتنە بریتیە لە ئەنجامدان و جێبەجێکردنی ڕێنوێنیکردن بە ئاستێکی پێویست کە حەقی خۆی بدرێتێ .

8. زانست و کار و ڕێنوێنی سێ ڕووی یەک ڕاستین ، ناتوانیت یەکێکیان لە ئەوەی تر داببڕیت ، زانست بنەما و مەرجی سەرەکیە لە ڕێنوێنی کردن و کارکردنیش ژیانیەتی ، و کەمی زانست ڕێگر نابێت لە ڕێنوێنی کردن،

9. پێویستە کە ڕێنوێنیکار ڕاستیەکانی ئیسلام بە چاکی بزانێت ، هەروەها ئەو سەردەمەی تێیدا دەژی ، هەرکەس سەردەمی خۆی و ئەوانەی تێیدا دەژین نەزانێت و نەناسێت ئەوا ژیانی لە بێئاگاییدا بەڕێ دەکات ، هەوڵ دەدات خەڵک ڕابکێشێت بۆ لای خۆی بۆ ئەوەی تێیان بگەیەنێت ، بەڵام ئەمە هەوڵدانێکی بێ سود و بێ کەڵک دەبێت.

10. ڕێکخستنی پێوەرەکانی دڵی ڕێنوێنیکار بەپێی قورئانی پیرۆز و سوونەتی پاک و فەرمایشتەکانی شێخ و ڕێنماییەکانی ، هەرکەس دڵی لەگەڵ ئەم شتە جێگیرانە ڕێک نەخاتەوە ئەوا قورس دەبێت بۆی کە بەناوی ئیسلامە قسە بکات.

11. ئەو ڕێگایەی کە ڕێنوێنیکار دەیگرێتە بەر پێویستە ڕێگەیەکی شیاو و گونجاو بێت ، چونکە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی شیاو پێویستە ڕێگاکەش شیاو بێت ، ئەوەش ڕێگای پێغەمبەرە (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ، نەوەک ئەو ڕێگایەی کە ڕێکخراوەکان دەیگرنە بەر بەوەی کە هەموو ڕێگایەک دەگرنە بەر بۆ گەیشتن بە ئامنجەکەیان ، لە ئێستادا پێویستە کە ڕێنوێنکارەکان ڕێگای هاوەڵانی بەڕێز (صەحابە) بگرنە بەر و تەنها ڕێگای شیاو و بەجێ بگرنە بەر لە هەموو بەشێک لە بەشەکانی ئایندا و ئەمانە دەبنە کەسانێک کە ئاین سەربخەن ، لە هەموو لایەک بڵاوی بکەنەوە.

12. ڕێنوێنکار هەرچی بڵێت لەخۆی ڕەنگ دەداتەوە ، پێچەوانەی ئەمەش دووڕووە کە باوەڕدار زۆر خۆی لێ دەپارێزێت ، قسەکانی ڕێنوێنکار لە ژیانی خۆی ڕەنگ دادەتەوە سەرەتا ، ئەگەرنا وەک ئاگری پوشە کە بەخێرایی گڕ دەگرێت و بەخێرایی دەکوژێتەوە .

13. ڕێنوێنکار خۆبەکەمزانە و خۆپەرست نییە و ئەمەش ئاکار و ڕەفتاری کەسە چاک و نمونەییەکانە ، ئایا ئیمانیش چاکبوون و بوون بە نموونە و لێهاتووبوون نییە ؟ بۆیە ڕێنوێنکار وەک هەر باوەڕدارێکی تر ڕەفتاری شیاو و

دروست دەکات هەتاکو ئەو ڕەفتار و ڕەوشتانەی تێدا دەچەسپێن و دەبنە بەشێکی دانەبڕاو لەو ، کە ئەوەش ئاکار و ڕەفتاری پێغەمبەرە (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی).

14. ڕێنوێنکار جەخت دەکاتەوە لەسەر ڕێنوێنی کردن ، کە ئەوەش دەربڕینی ڕێزگرتنیەتی لە بانگەوازەکەی ، بۆیە ئەوە بە گەورە دادەنێت کە خودا بە گەورەی داناوە ، ئەگەرنا درۆزن دەبێت لەوەی دەیڵێت.

15. ڕێنوێنیکار هەردەم بە چاوکراوەیی ڕەفتار دەکات و بە پێچەوانەی فیترە و ئاکاری بنەڕەتی مرۆڤەکان ناجوڵێتەوە ، هەرگیز ناکرێت چاوپۆشی لە مرۆڤ بکرێت لە لایەنی لاوازی و حەز و ئارەزووەکانیەوە ، بەڵکو پێویستە ئەم لایەنانە ئاڕاستەیان بگۆڕدرێت بۆ باشتر و چاکتر .

16. نارەحەتی بەشێکە لەوەی بەسەر ڕێنوێنکار دێت ، بەڵام بەمە ناگۆڕێت ، بەڵکو پێویستە لەسەر ڕێگاکەی بەردەوام ببێت و بێهیوا نەبێت و تاقەتی نەپڕوکێت.

17. ڕێنوێنکار کەسێکی خاوەن ڕەحمەت و سۆزە ، هەرگیز ڕێگا و ڕێوشوێنی توند و نارەحەت نایەت بە خەیاڵیدا بۆ سەرخستنی حەق و ڕاستی .

18. گیانفیدایی لە گرنگترین ئاکارەکانی ڕێنوێنکارە ، پێویستە هەڵگری ئاکاری دەروێشەکان بێت ، بەڵکو ئەگەر کەسێک کەمترین و بچوکترین ئاکارەکانی دەروێشانی تێدا نەبوو ئەوا لەدوونیادا دەرناچێت بە شێوەی ڕێنوێنکارێکی چاک ، بەمەش پێویستە گیانبەخشین و گیانفیدایی لەپێش هەموو شتێک بێت.

19. ڕێنوێنکار مرۆڤێکە کە خۆی کامڵ کردووە بە نزا و پاڕانەوە کە ئەوەش بنەڕەتی موخڵیس بوونە.

20. ڕێنوێنکار مرۆڤێکی واقیع بین و لۆژیکیە ، کارەکانی ئەنجام دەدات لە ئاست و سنووری لۆژیک دا.

21. ڕێنوێنکار زۆر هەستیارە بەرامبەر باوەڕی خەڵک ، جەرگی دەبڕدرێت کاتێک کوفر دەبیستێت یاخود هەڵگەڕانەوە لە ئاین یاخود دورکەوتنەوەی خەڵک لە ئاین دەبینێت

22. ڕێنوێنیکار هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی کارەکانی لە چوارچێوەی خۆشەویستی و بەپەرۆشبوون و عەشق دا . سەرفراز نابێت ئەگەر عاشق نەبێت بە ڕێنوێنی کردن و حەزی پێی نەبێت و چێژی لێ نەبینێت لەکاتی بەئەنجام گەیاندنی و گرنگ نەبێت بەلایەوە.

23. باوەڕی قوڵ ، واتا قوڵی جیهانی ڕوحی ، سیفەتێکە کە لە ڕێنوێنکار دانابڕدرێت ، ئەمەش واتا گەیشتنی بە دڵنیایی (الیقین) ، چەندە بشگات بە دڵنیایی ئەوا پایەدار و سەرفرازتر دەبێت.

24. لەکاتی ئەنجامدانی ڕێنوێنکار بە پیشەکەی پێویستە دڵێکی فراوان و ڕوحێکی خاوێنی هەبێت ، بۆ ئەوەی ببینێت کە خودا و پێغەمبەرەکەی (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) و شێخەکەی بۆی بوونە بە پشت و پەنا لە کارەکەیدا ئەوا پێویستە ژیانێکی خاوێنی هەبێت وەک ئەو بانگەوازە خاوێنەی دەیکات ، ئەمەش تەنها بە خاوێنی دڵ و پەیوەندبوون بە شێخی تەریقەتەوە دەبێت هەمیشە.

لە پوختەی قسەکانیشدا دەڵێین : حەزرەتی سەید شێخ سوڵتان خەلیفە موحەمەدی موحەمەد کەسنەزانی (هیمەتی حازربێت) لە باسی گرنگی ڕێنوێنی کردن و پلە و پێگەی ڕێنوێنکار دا دەفەرموێت : (پاداشتی ڕێنوێنی کردن گەورەیە لە سەرووی ڕۆژووگرتنەوەیە چونکە ڕێنوێنیکردن لە پاداشتیدا کەسی ڕێنوێنکار پاداشتەکەی بۆ کەسی ڕێنوێنکار و شێخەکەی و شێخی شێخەکەی هەتا پێغەمبەرە (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ، بۆیە ڕێنوێنکار قورئانێکی وتەبێژە ، و ڕێنوێنکردن لوتکەی گوێڕایەڵی بوونە بۆ خودا)

لە فەرمایشتەکانی حەزرەتی سوڵتان خەلیفە موحەمەدی موحەمەد کەسنەزانی حوسەینی (هیمەتی حازر بێت) دەربارەی ڕێنوێنیکردن و ڕێنوێنکار :

- دەفەرموێت : ئەی دەرویشەکانی کەسنەزان : بزانن کەوا ئێوە نوێنەرایەتی خاوێنترین کۆمەڵەی ئەم ئومەتە دەکەن ، ئێوە کارتان ڕێنوێنیکردنە بە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری لە خراپە ، کەواتە ئێوە باشترین ئومەتن ، بێگومان کارەکەشتان گەورەترین کارە.
- دەفەرموێت : بە ڕێنوێنی کرد بەڵا و ناخۆشی لادەچێت
- دەفەرموێت : خەلیفە بریکاری شێخە ، چونکە خەلیفە ڕێگەی پێدراوە لەلایەن شێخەکانەوە کە ڕێنوێنی بکات ، خەلیفە ئەگەر ڕاوەستا لە ڕێنوێنی کردن ئەوە واتا نوێنەرایەتی شێخ ناکات و نوێنەرایەتی حەزرەتی پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ناکات.
- دەفەرموێت : خەلیفەی ڕێنوێنیکار ڕێگاکەی کراوەیە بەرەو خودای گەورە ، خەلیفەی ڕێنوێنکار شمشێری خودایە ، خەلیفەی ڕێنوێنیکار ئەو کەسەیە کە نوێنەرایەتی تەریقەت و شەریعەت دەکات ، چونکە خەلیفەی ڕێنوێنکار قورئانێکی وتەبێژ دەبێت ، بۆیە پلەی خەلیفەکان گەورە و بەرزە لەلای خودای گەورە ، ئەوانەی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە دەکەن ، ئەوانە خودای گەورە تایبەتمەندی کردوون و فەرموویەتی : (إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ

الْأَشْـــهَادُ) (واتا : ئێمە پەیامبەران و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لە دونیا و دواڕۆژدا ســـەرکەوتوو و ســـەرفرازیان دەکەین) . ئەوان لەگەڵ پێغەمبەرانن ، چونکە پەیامی پەیامهێنەران دەگەیەنن ، ئەوان ڕێنوێنکارەکانن کە نوێنەرایەتی : (بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ) (واتا : ئەوە بگەیەنە کە لە خوداوە بۆت دابەزیوە) دەکەن ، واتا ئەوەی خودای گەورە فەرموویەتی بە حەزرەتی پەیامهێنی مەزن (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) ، خەلیفە گەیەنەری پەیامی خودایە بۆ ئومەت ، پلە و پێگەی خەلیفەکان لەلای خودا زۆر گەورە و بڵندە.

- دەفەرموێت : پێویستە لەسەر خەلیفە کە دیدار و لێدوانی هەبێت ، دەربارەی تەریقەت و هیمەتی شێخ و بەســـەرهاتەکانی شـــێخەکان و پەیامهێنەکان و بەســـەرهاتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکان و بەسەرهاتەکانی ژیاننامەی پەیامهێن (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ، هەروەها لەسەر ئاکار و ڕەفتاری هاوەڵەکان (صـــەحابەکان) ، ئەمە هەمووی لە ســـیفەت و ئاکاری خەلیفەیە ، مورید فێر دەکات و موریدیش پێویستە جێبەجێی بکات
- دەفەرموێت : ئەی خەلیفە ئاگادار و هۆشـیار ببە کە لەو کاتەوەی ئەم ئەرکەت خستۆتە سـەر شـانی خۆت بوویت بە هەڵگری ئاڵای حەزرەتی عەلی ، پێویستی ڕۆشنبیری ئاینی و ڕۆشنبیری سۆفیگەریت هەبێت
- دەفەرموێت : خەلیفە نابێت بخەوێت ، لە تەکیە دەمێنێتەوە هەتا بەیانی خەریکی خوداپەرستی دەبێت ، سـەیرە ! دەڵێت من خەلیفەم کەچی دوای نوێژی عیشـا دەرگای تەکیە دادەخات و ڕادەکاتەوە بۆ ماڵەوە ، ئایا خودا ناتبینێت ؟ مەگەر نافەرموێت : (إِنَّنِي مَعَكُما أَسْـــمَعُ وأَرى) (واتا: من لەگەڵتانم دەبینم و دەبیستم) ، تۆ بەخۆت دەڵێیت خەلیفە کەواتە خەلیفە و جێنشینی پێغەمبەریت (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی)
- دەفەرموێت : ڕووبکەرە خودای گەورە ، بڕوانە بۆ صەحابەکانی حەزرەت (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ، چۆن گیانیان فیدا کرد ، لە ڕوسـیا و وڵاتانی تردا شـەڕیان دەکرد ، گۆڕی صـەحابەکان هەموو زەوی ئیســـلامی پڕکردووە ، ڕوحیان فیدا کرد ، تۆش لە ماڵی خۆتی ، دەخۆیت و دەخۆیتەوە بەڵام ناتوانیت شـــەو لە تەکیە بمێنیتەوە و نەخەویت ، چۆن خۆت بە جێنشـــین (خەلیفە) دادەنێیت و

ڕادەکەیتەوە بۆ ماڵەوە ، کەســـێ خەمی خۆی نەبێت چۆن خەمی خەڵکی دەبێت ، تۆ خەلیفەیت ئەگەر پەرستش نەکەیت ئەوا ناتوانیت خۆت لە خودای گەورە دەرباز بکەیت

- دەفەرموێت :خەلیفە پێویستــە دڵی ئامادە بێت لەگەڵ خودای مەزن دا جارێک لە ئاســمان و جارێک لە زەوی : (أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَــوْنَ أَنفُسَــكُمْ) (واتا : ئێوە فەرمان بە چاکەکاری دەکەن و خۆتان لەیاد دەکەن) ، ئەی خەلیفە تۆ خەڵک دەهێنیت بۆ تەکیە لەکاتێکدا خۆت لەیاد کردووە ، کوا شـــەو نوێژەکەت ؟ ، کوا پەرســتشــەکەت ؟ کوا زیکر و ویردەکانت ؟ دواتر چی وەڵامی شـێخەکانی تەریقەت دەدەیتەوە ؟
- دەفەرموێت : خودای گەورە دەفەرموێت : (وَ جَاءَ مِنْ أَقْصَـــى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْـــعَىٰ قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ) (واتا : لەوپەڕی شارەوە کەسێک هات و وتی ئەی خەڵکینە شوێنی پەیامهێنەران بکەون) ، ڕێنوێنی کردن چەندە گەورەیە ، ئەوانەی خەڵک ئاڕاســـتە دەکەن پێگەیەکی گەورەیان هەیە لەلای خودا ، بەم دوو وشـــەیە (اتَّبِعُوا الْمُرْسَـــلِينَ) (واتا : شـــوێن پێغەمبەران بکەون) ، بەمەش دەبنە وشیارکەرەوەی خەڵک و ئومەت
- دەفەرموێـت : ڕوحی تەریقەت و جوڵەکەی بریتیە لە پێـدانی پەیمـان (بەیعەت) و بڵاوکردنەوەی ، ڕێنوێنی هەرە گەورەیە ئەوە .
- دەفەرموێت : ئەگەر کەســـێک لە ڕێنوێنیکردن بوەســـتێت ئەوا شـــێخەکانی تەریقەت هاوکاری و فەریادڕەسی بۆ ئەو کەسە دەوەستێنن
- دەفەرموێت : تۆ هیمەت و گرجوگۆڵی و هێزت دەوێت تا قەناعەتیان پێ بکەیت ؟ ، هێزەکەت دەســـت دەکەوێت لەڕێگای ڕێنوێنیکردنەوە
- دەفەرموێت : ئێمە ڕێنمایی خەڵک دەکەین بە زمان ، داوایان لێ دەکەین سەفەر بۆ خزمەت خودا بکەن ، دووربکەونەوە لە فرت و فێڵ و خیانەت
- دەفەرموێت : مـانـای چییە کە فەرمـان بە چـاکە بکەن و ڕێگری لە خراپە بکەن ؟ ئەوە واتـا : (إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ) (واتا : ئەگەر خودا سەربخەن ئەوا ئەویش سەرتان دەخات) ، ئەمەش واتا خودا پشـــتیوانت دەبێت ، یارمەتیت دەدات و بۆت دەڕەخســێنێت ، خەلیفە کێیە و تواناکەی چییە ئەگەر بۆی

ئەڕەخسێت لە خوداوە و لە هیمەتی پەیامهێنەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) و هیمەتی شێخەکان ؟ ، ئەوکاتە دەبێتە کەسێکی ئاسایی ، ئەوەی گومانی لەم ئایەتە پیرۆزە هەبێت ئەوا بێباوەڕە.

- دەفەرموێت : ڕێنوێنیکردن گەورەترین و بەرزترین شێوازی خوداپەرستیە ، بە ڕێنوێنیکردن فەرزەکان دەچەسپێن ، ڕێنوێنیکردن تێکۆشانە ، بڕبڕەی پشت و دڕکە پەتکی تەریقەت بریتیە لە ڕێنوێنیکردن (ئیرشاد)

- دەفەرموێت : ئەگەر کاتتان نییە خەڵوەت بکێشن ، ئەوا ڕێنوێنیکردن گەورەترین خەڵوەتە بۆتان ، کەهەموو شتێک گەورەترە ڕێنوێنیکردن ، ئێوە : (فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رفيقا) (واتا : ئەوکەسانەن کە لەگەڵ ئەوانەن کە خودا نیعمەتی بەسەریان دابارندووە لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدەکان و پیاوچاکان و ئایا کێ لەو هاوڕێیانە باشترە) ، ئێوە شوێن پەیامهێنەر و نێردراوان دەکەون ، شوێن گەورەی پەیامهێنان (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەکەون ، کۆتاپێهێنەری پەیامهێنان (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) کافییە و بەسە بۆتان ، ئەو گەورەی پەیامهێنەرانە و ئەوان هەموویان شوێن ئەو دەکەون

- دەفەرموێت : ئەو خەلیفانەی دەڕۆن بۆ ئیرشاد ، ڕوحیانەتی شێخەکانی تەریقەت دێن و دەگەڕێن بەسەر ماڵەکانیاندا ، هەر منداڵیکیان پێخەفەکەی لاچووبێت دەیدەنەوە بەسەریان ، من ئەوەم بینیوە ، ئەوە بوونی هەیە پشتیوان بەخوا ، ئێوەش و ئەو خەلیفانەشی بۆ ئیرشاد دەچنە دەرەوە ئەمە دەبینن و ببین کە ئەوان چۆن ئەو کەراماتانە دەبینن ، بەڕێ بکەون بۆ ڕێنوێنیکردن و بڕوانن چ هێزێک لەگەڵتانە ، ئەم هێزە نابینیت ئەگەر لەماڵی خۆت دانیشتبیت ، هێز لە ڕێنوێنیکردن دایە و ئێوە دەتوانن تاقی بکەنەوە ، شێخ چیت بۆ دەکات ؟ تۆ برۆ ڕێنوێنی بکە و هێز و توانای شێخەکانت و کەراماتەکانیان دەبینیت

- دەفەرموێت : دەرویش لێرەدا هێزی ڕووحی نابینێت ، چونکە شێخەکانی تەریقەت ئامادەن ، پێویستی بەوە نییە ئەو هێزە ببینێت ، بەڵام کاتێک ڕێنوێنی دەکات هێزێکی ڕووحی زۆر گەورە دەبینێت

- دەفەرموێت : تێکۆشانی ئەمڕۆ بە چەک نییە ، تێکۆشانی ئەمڕۆ بەئاگاهێنانەوەیە بە زمان

- دەفەرمویت : ڕێنوێنیکردن پێویســتە ســەرەتا لەگەڵ خودی خۆت بیکەیت ، بەوەی کە دەروونی خۆت خاوێن بکەیتەوە ، ڕێگری لێ بکەیت لە خراپەی گەورە و بچوک و ئەوانەی قەدەغەن ، پاشــان دێیت بۆ ماڵەکەت و منداڵەکەت و دایکت و کەســوکار و بنەماڵەکەت و هاوســەرەکەت بۆ ئەوەی تەریقەت وەربگرن ، بۆ ئەوەی دەســت بکەیت بە پەروەردەکردنی منداڵەکان بە پەروەردەیەکی موحەمەدی ، وەک چۆن هاوەڵان (ســەحابەکان) و بنەماڵەی پەیامهێن منداڵەکانیان پەروەردەکردووە ، ڕێگای ئێمە ڕێگای ئالوبەیتی پەیامهێنە ، ڕێگەی پەیامهێنە (ســەڵەوات لەســەر خۆی و بنەماڵەکەی) ، پێویســتە هەموو خەلیفەیەک هەوڵبدات بۆ کردنەوەی تەکیەیەک بۆ خانمان ، خەلیفەکە خانمێکی ڕۆشــنبیر و لێهاتوو دابنێت بۆ ســەرپەرشــتی تەکیەکە ، بۆ ئەوەی پەیام و ڕاکانی ئێمە بگەیەنێت ئەو خاتوونانەی ناو تەریقەت فێری فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە بکات ، پاشان شەریعەتی پەیامهێن (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) فێرببن ، پاشان تەریقەت چونکە بنچینەی ئێمەن ، بەبێ بنچینە و بناغەش بێگومان باڵەخانەیەک دەڕوخێت ، پێویستە هەموو دەروێشێک لە خۆیەوە دەست پێ بکات ، پاشان خێزانەکانی و هاوڕێکانی و پاشان خزم و دۆستەکانی ، ئەگەر بەم شێوەیە نەبوو هیچ نابینیت ، چۆن دەتەوێت خودا لە تێکۆشەرانت هەژمار بکات ؟
- دەفەرمویت : پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) دەفەرمویت : (فەرمانمان پێ کراوە کە بە ئەندازەی تێگەیشــتنی خەڵک لەگەڵیان بدوێین) پێویســتە لەســەر خەلیفەش کە بەم شــێوەیە مامەڵە لەگەڵ خەڵک بکات ، پێویستە لەگەڵ هەموو کەسێک بە ئەندازەی زانست و عەقڵی قسە بکات
- دەفەرمویت : خەلیفەی باش پێویســـتە ڕێنوێنیکار بێت ، پێویســـتە خەلیفە و ڕێنوێنیکارەکان بچن و پەیمان (بەیعەت) بدەن ، فەرمان بە چاکە بکەن و ڕێگری لە خراپە بکەن ، ئەمە کاری ئێمەیە و ئەمە ئامانجەکەمانە و هۆکاری دەروێشــێتیەکەمانە ، ئەگەر بەم شــێوەیە نەبوایەین ئەوا وەک تەریقەتەکانی تر کۆتاییمان پێ دەهات ، سوپاس بۆخودا تەریقەتەکەتان گەورەترین تەریقەتە لە جیهاندا ، سوپاس بۆ خودا کە شێخەکەتان ئامانجی ڕێنوێنی و ڕێنمایی کردنە
- دەفەرمویت : ئێوەن دەروێشــەکانی کەسنەزانی ، پێویستە تەنها لە خودا بترسن ، بڕۆ و با شــەهیدت بکەن وەک خەلیفە مەجید و خەلیفە عەبدولڕەحمان و خەلیفە عەبدولجەبار کە شــەهیدەکانی

کەســنەزانین هەتا قیامەت ، ئێمە باوانە شــانازی دەکەین کە شــان و شــکۆ و پێگەی کەســنەزانیان پاراســتووە بە خوێنی پاکیان ، دەڵێین ئەی خودایە ئێمە ڕێنوێنیکار بووین ، فەرمانمان بە چاکە دەکرد و ڕێگریمان لە خراپە دەکرد ، ئەمە پەیمانی ڕێنوێنکارەکانە : (إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً) (واتا : من لەســەر زەویدا جێنشــینم داناوە) ، ئەمانە ئەو جێنشــینانە بوون کە لە پێناو خودادا ، ببینە چەند سەریان بەرزە ، تۆش ترس لە سەرت نیشتووە ، سەرت بۆ خێزان و منداڵ و پارە و ژیان دانەواندووە ، ئەو کەســەی ناتوانێت ڕێنوێنی بکات ، با شــایەتومان بهێنێت و لە ماڵەوە دابنیشــێت و نەڵێت : من کەسنەزانیم ، بەڵکو بڵێت : من شەیتانیم بەندەی دونیام.

- دەفەرموێت : هەرکەس خەلافەت وەربگرێت بەرپرســیار دەبێت لە ڕێنوێنیکردن ، ڕێنوێنی لە هەموو حاڵەتێکدا پێویستە ، بۆچی ئێمە هەندێ خەلیفەمان لەوەی تر لا پەسەند ترە ؟ چونکە ڕێنوێنکارن .
- یەکێک لە خەلیفەکان بە حەزرەتی شێخی فەرموو ، قوربان داوای دوعا و نزای ئێوە دەکەین بۆ ئەوەی دەربچین بۆ ڕێنوێنیکردن ، حەزرەتی شــێخیش (هیمەتی حازر بێت) فەرمووی : براکەم ، ڕێنوێنی پێویســتی بە نزا نییە ، ئەو ڕێنوێنیکارەی کە دەردەچێت خودا و پەیامهێنەر و شــێخەکانی تەریقەت و پیاوچاکان چاویان لێیەتی هەتا دەگەڕێتەوە ، پێویســـتی بەوە نییە کە بڵێت : نزای چاکم بۆ بکەن ، کاتێک مەبەستی ڕێنوێنی بێت ، (کارەکان بەپێی نیەت و مەبەستەکانە) ، من ڕقم لەم جۆرە قسەیەیە ، ئەگەر بە ویســتی خودا نەبێت کەس ناتوانێت دەربچێت حەزرەتی شــێخ قادر فەرمووی : "ئەگەر حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی (هیمەتی حازربێت) ئامادەنەبوو و لەپاڵت نەوەستا ئەوا ناتوانیت دەســت بخەیتە دەســتی کەس و تەریقەتی پێ بدەیت ، تۆ وادەزانیت ئەمە بە هێزی باوکتە کە تەریقەت دەدەیت ؟ ، ئەگەر شــێخەکانی تەریقەت ئامادە نەبن ناتوانیت تەریقەت بدەیت تەنانەت بە منداڵێک ، ئەگەر خودا ویستی لەسەر نەبێت ناتوانیت تەریقەت تەنانەت بدەیت بە پشیلەیەک.
- دەفەرموێـت : تۆ ڕێنوێنی دەکەیـت کەواتە تۆ لەگەڵ پەیـامهێنەریـت (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) ، تێدەکۆشیت لەگەڵ پەیامهێنەر ، وەک هاوەڵان (سەحابەکان) دەبیت،
- دەفەرموێـت : بۆ ڕێنوێنی کردن دەربچن خۆتـان لەگەڵ پەیـامهێنەر (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) دابنێین ، شـانتان بدەنە پاڵ شـانی ئەو ، چۆن ؟ ئەگەر تۆ هۆشیارکار (مەهدی) بیت ، ئەو

کەســەی کە خەڵک ڕێنوێنی دەکات مەهدییە ، کە جێنشـینی پەیامهێنەرە و زیندووکەرەوەی ئیسـلامە ، واتا تۆ هاوڕێ و هاوەڵی پێغەمبەریت (سـەڵەوات لەســەر خۆی و بنەماڵەکەی) لە ڕۆژێکدا کە سـێبەر نییە جگە لە سێبەری ئەو.

- دەفەرموێت : تۆ لەوێدا پێگە و پلەت بەرزە و دەتوانیت ڕێنوێنی بکەیت و ببیتە تکاکار بۆ خێزان و کەسوکارت
- دەفەرموێت : ڕێنوێنیکاری جێنشین نامرێت ، بەڵکو شەهیدە
- دەفەرموێت : ڕێنوێنیکار لەلای خودا و پەیامهێنەرەکەی (ســـەڵەوات لەســـەر خۆی و بنەماڵەکەی) گەورەیە ، بۆچی ؟ چونکە ڕێنوێنی خەڵک دەکات ، بەهۆشـــیان دەهێنێتەوە ، کەواتە ئەو مەهدییە ، ڕێنوێنی دەکات بۆ ڕێگای ڕاست (الصراط المستقیم)
- دەفەرموێت : خەلیفەکان پێویســتە هەمیشــە ڕێنوێنی بکەن و نەوەســتنەوە لە ڕێنوێنیکردن ، هەموو خەلیفەیەک کە لە ڕێنوێنی بوەســـتێتەوە ئەوا بەرەکەتی لەلا نامێنێت ، دەروێش ئەگەر کار بە ویرد و زیکرەکانی نەکات و نەیەت بۆ تەکیە و کاری دەروێشێتی نەکات ئەوا بەرەکەتی لەلا نامێنێت.
- دەفەرموێت : ئەو تەکیەیەی کە ڕێنوێنی تێدا نەکرێت تەکیە نییە ، بەرەکەتی تێدا نییە ، شـــێخ دان بەم جۆرە تەکیەیە نانێت و نایەوێت

اللهم صل على سيدنا محمد الوصف والوحي والرسالة والحكمة وعلى آله وصحبه وسلم تسليما

(والحمد لله رب العالمين)

سەید شێخ

شەمسەدین موحەمەد نەهرۆ کەسنەزانی قادری حوسەینی

سەرۆکی تەریقەتی پیرۆزی عەلیی قادری کەسنەزانی لە جیهاندا